# ناسنامەی کتێب:

ناونیشان: گوڵ لە شیعری کلاسیکی کوردیدا

نووسینی: کێوان پەروین

بابەت: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

نەخشاندنی بەرگ: کاکل گۆران

چاپ: چاپی یەکەم، ٢٠٢١ی میلادی

چاپخانە: چاپخانەی سارا

نرخ: ٣٠٠٠ دینار

زنجیرەی هۆمین: ٦

لە بەڕێوبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٤٢٨) ساڵی (٢٠٢١)ی پێ دراوە.

## ناوەڕۆک:

## چەند سەرنجێک لەبابەت ڕێنووسی کتێبەکەوە:

* هەوڵدراوە کە دەقی هێندراوەی کتێبەکانیتر، یان ئەو بەیتە شعرانەی وەک نموونە هێندراونەتەوە؛ بە ڕێنووسی کتێبەکە خۆی، یان دیوانەکە بنووسرێن، بۆیە دەشێت تێکڕای نووسراوی ئەم کتێبە، جودابێت لە بەیتە شیعرەکان و دەقە هێندراوەکان...

* کاتێک وشەیەک بە دوو(ی) کۆتایی هاتبێت، وەک (ڕۆشنایی، تەنیایی...) لە پاشاندا گرێیەکی درووستکردبێت، یان پاشگرێکی وەرگرتبێت، ناچار بە زیادکردنی (ی) خستنەسەر دەبین، بەڵام بۆ جوانتر دەرکەوتن و جواننووسی؛ دوو(ی)یمان بە باشتر زانیووە، بۆ نموونە: تەنیاییەکان، ڕۆشنایی چاو...

* بە پێی یاسای فۆنەتیکی کوردی، لە هەر وشەیەکدا پێویست بە درێژکردنەوەی دەنگی (و) بکات، بە دوو(و) نووسراوە، بۆ نموونە: نووسین، ڕووخسار، ڕوومەت، بوون، قووڵ، ڕابردوو، دوو...

**بێ نەقشێ تە، نەقشێ خامە خامە**

**بێ نـــامێ تە، نامە ناتەمامە**

**"خانی"**

# پێشەکی

شیعری کلاسیکی کوردی، شیعرێکی ڕەمزئامێزە، پڕاوپڕە لە هێما و دەستەواژەی ئەفسانەیی، لە چەمک و درکەی عیرفانی. ئەم شیعرانە بە گەرد و تۆزی ئەفسانە و هێماگەریی ئایینی و بیروباوەڕی کەونارای مرۆڤەوە تەنـدراون، یاخود دەبێت بڵێین؛ شیعری کلاسیک چون دەریایەکی قووڵ و فراوانە، لەبن ئەم دەریایەدا دوڕڕ و مرواری و یاقووتی گرانبەها هەیە، وەلێ بەدەستهێنانیان مەلەوانێکی کارامە و بابایەکی خاراوی دەوێت، چونکە شەپۆل و پێلەکانی ئەم دەریایە هێندە بەگوڤژم و تینن کە قورسە لێیان دەربچیت، بەڵام هەینێ دەستت گەیشتە سەدەف و مرواری و داوەکانت بڕین و فووت لە تۆز و خۆڵی سەر دێرەکان کرد؛ ئینجا تێدەگەیت بە چ گەنجینەیەک خەنی بوویت و لە چ کەوسەرێک تێراو بوویت!! بە خوێندنەوەی سەرپێیی بەیت و دێڕی شیعری کلاسیک، چێژێکی زۆر دەبینیت، بەڵام واتایەکی وات دەست ناکەوێت، بەڵکە پێویستی بە وردبینی و تێڕامانێکی زۆر هەیە، خۆ ئەگەر واش شتێکی لێ هەڵکرێنیت هەر باشە!

کاتێک خوێنەر بەر غەزەلێکی کلاسیکی دەکەوێت؛ گەلێک ناو و چەمک و دەستەواژەی ڕەمزی دێنە بەردەمی، بۆ نموونە؛ ناوی درەخت و گژوگیاکان، ناوی شوێنەکان، ناوی کەسایەتییە ئەفسانەییەکان، ناوی گوڵەکان...هتد،

ڕەنگە بپرسێت: ئایا ئەم ناوانە هەر لەخۆڕا و بە سادەیی بەکاربراون، یان مەبەستێکی دیکەیان لەپشتەوەیە؟ ئایا ئەم ناوانە تەنیا ڕووکەشین، یان ڕەمزین؟ ئایا پەیوەندییان بە ئەفسانە و ئوستوورە و هێماگەرییەوە هەیە؟؟ ئەم کتێبە باس لە ڕەمزی گوڵەکان دەکات لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، ئەو گوڵانە دێنێتە بەرباس و لێیان دەکۆڵێتەوە کە وەک ڕەمزێک بۆ مەبەستێکی شاراوە و نادیار بەکاربراون. ئایا بۆچی نێرگس بە چاو و سونبول و ڕێحانە بە کەزی و پرچ و لالە بە ڕووخسار چوێندراوە؟ ئایا دەبێت تەنیا چواندنێکی ڕووکەشیانە بێت، یاخۆ مەبەستی دیکەی لەپشتە؟؟ بە زانینی ڕەمزی ئەو گوڵانە؛ کۆدێکی تری شیعری کلاسیکمان بۆ دەکرێتەوە و تێگەیشتن لە غەزەل و دەقی شیعری کلاسیکی ئاسانتر دەکات...

لەم لێکۆڵینەوەیەدا دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کوردیمان وەک کەرەستەیەکی سەرەکی بەکارهێناوە، زیاد لە بیست دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کوردیمان هێناون و کەڵک لە نموونەکانیان وەرگیراوە، بەڵام بۆ زۆر بەشی لێکۆڵینەوەکە؛ زیاتر پشت بە نموونەی شیعریی چەند شاعیرێک بەستراوە، وەکوو: جزیری، نالی، مەحوی، سالم و وەفایی... هەروەها بەپێی پێویست نموونە بۆ نیاز و مەبەستەکانمان هێندراوەتەوە. دەبێت ئەوەش بڵێین کە؛ ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنیا لەسەر شیعرە کوردییەکانی شاعیرانمان کراوە، نەک فارسی و عەرەبییەکانیشیان. گوڵەکانی وەک: نێرگس و سونبول و ڕەیحانە و لالە و نەسرین و وەنەوشە و ...هتد، گوڵە سەرەکییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەن و بەپێی پیت لێیان نەدواوین، بەڵکە کام گوڵ زۆرترین بەکارهێنانی هەبووبێت، ئەومان سەرەتا

داناوە و لێی دواوین. لەبابەت زانیاریی گوڵەکانەوە تووشی بارگرانییەکی زۆر هاتین، چونکێ بەداخەوە سەرچاوەیەکی وامان لەبەردەستدا نەبوو لە زمانی کوردیدا، ئەوەی هەبوو بە زمانەکانی فارسی  زیاتر سوودی لێ وەرگیراوە، ئەمە بۆ ئەفسانە و ئوستوورە و هێماگەری و ڕەمزەکانیش ڕاستە؛ ئەوانیش جێی داخە کە بە کوردی هیچ سەرچاوەیەکی وا نەبوو کە پشتی پێ ببەستین، بۆیە لەبابەت بیرورِا کۆنەکان و هێماگەری و ئوستوورەکانەوە دووبارە سوود لە سەرچاوە فارسییەکان وەرگیراون و  برِی پێویستمان لێ وەرگرتوون.

پێشتر کاری لەم جۆرە بۆ شیعری فارسی کراون و زۆر باشتر و قووڵتر لە ڕەمزی گیا و گوڵەکانیان کۆڵیوەتەوە، نەک هەر ئەوەندە؛ دەبێت ئەوە بڵێین کە لە هەر ڕوانگەیەکەوە لە شیعری فارسی کۆڵدراوەتەوە و هێما و ناو و دەستەواژە ڕەمزئامێزەکانیان بژارکردوون و دەریان هێناون، بەڵام چەندێکی ڕوانیمان، ئەم هەوڵانە لە زمانی کوردیدا نەبوون لەبابەت شیعری کلاسیکەوە، ئەوەی کە کرابوو چەند هەوڵێکی پچرِپچر بوو، نەگەیشتبوونە ئاستێکی وا کە وەک سەرچاوەی سەرەکی سوودیان لێ ببینین.  شیعری کلاسیکی کوردی، لە سێبەری شیعری کلاسیکی فارسیدا درووستبووە، ئەمە وای کردووە لێکچوونێکی فرە هەبێت لە شیعرەکاندا، بۆیە بە باشمان زانی کەڵک لەو سەرچاوە فارسیانە وەربگرین کە پێشتر لەسەر هێما و ڕەمزەکان کرابوون. بەهیوام ئەم لێکۆڵینەوەیە کەلێنێک لەو بۆشاییەی کە هەیە؛  پرِ بکاتەوە، سەرەتایەکیش بێت بۆ لێکۆڵینەوە لەو

ڕەهەندانەی کە تا ئێستا کاریان لەسەر نەکراوە لە شیعری کلاسیکدا، چونکە شیعری کلاسیک تا لێی وەکۆڵیت؛ لێی پەیدا دەبێت..

کێوان پەروین

ڕەشەمەی ٢٧٢٠ کوردی

# گوڵی نێرگس

**"هەناسەم زوڵفەکەی لادا و مەیلێکی نەکرد چاوی**

**نەسیم ئەنگوت و شەو رابورد و نەرگس هەر لە خەودایە"**

**"نالی"**

ناوی نێرگس لە زمانی کوردیدا، بە چەند شێوە نووسینێک هاتووە، لەوانە: (نێرگس، نەرگس، نێرگز، نەرگز...). لە زمانی عەرەبیدا "نرجس، عبهر" و لە فارسیدا "نرگس" و لە ئینگلیزیشدا "Narcissus"ی پێ دەڵێن، بنەرەتی ناوەکەش دەگەڕێتەوە بۆ لاتینی و لە "Narkissos"ەوە وەرگیراوە. نێرگس یەکێکە لە ڕووەکە هەرە کۆنەکانی جیهان، گیایەکی تەمەندرێژی سەلکدارە، لە سەلکەکەوە گەڵا و گوڵی دەردەچێت.[1] "نێرگس گیایەکی بەهاری لاسک بەرزی کولۆرە، گوڵێکی پەڕەسپی و زەردی بۆنخۆش دەگرێت."[2] ئەو جۆرەی کە لە کوردستان دەڕوێت؛ پەڕەی گوڵەکەی سپییە و ناوەڕاستی گوڵەکەش زەردە و بۆنێکی خۆشی هەیە. مێرگی نێرگس، پێی دەوترێت "نێرگسەجاڕ".

---

[1]. کەمال جەلال غەریب، کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، چاپخانەی ئاراس، چاپی دووەم، شەقامی گوڵان هەولێر، ۲۰۱۲، ل ٤٣١.

[2]. فەرهەنگی خاڵ.

ئوستوورە(myth)یەک هەیە لەبابەت پەیدابوونی نێرگس. کورتەی ئوستوورەکە باس لەوە دەکات کە "لاوێکی جوانخاس و شۆخوشەنگ هەبووە بە ناوی"نارسیس"، ئەم کورە هێندە جوان و شەنگ بووە کە هەموو کچانی شێت و شەیدای خۆی کردووە. یەکێک لەو کەسانەی کە عاشقی دەبێت، پەرییەکە بە ناوی "ئیکۆ"، هێندە عاشقی دەبێت، تا وای لێدێت هەستی خۆی بۆ "نارسیس" دەردەبڕێت...

"نارسیس" هیچ بەلایەوە گرنگ نابێت و گویێ ناداتە هەستی کەفوکوڵکردووی "ئیکۆ". لە بەرانبەر ئەمەدا "ئیکۆ" لای خوداکان شکایەت لە "نارسیس" دەکات و داوای تۆڵە دەکات. خوداکان بە داواکەی "ئیکۆ" ڕازی دەبن و بڕیاردەدەن "نارسیس" بە دەردێکی خراپ لەناو ببەن...

ڕۆژێک "نارسیس"  بۆ ڕاو و شکار دەچێتە دەشت و دەر. بە مەبەستی پشوو، لادەداتە ئاوێکی ڕوون و وێنەی خۆی دەبینێت لە ئاوەکەدا. لەمەوە عاشقی خۆی دەبێت! تا جارێک هەوڵ دەدات وێنەی ناو ئاوەکە بگرێت و بەم کارەی ئاوەکە لێڵ دەکات. زۆر چاوەڕوان دەبێت تا ئاوەکە ڕوون ببێتەوە، وەلێ لەم چاوەڕوانییەدا وردەوردە لاواز دەبێت و "نارسیس" گیان دەدات... "ئیکۆ" لەدوای نەمانی زۆر خەمی خوارد، بۆیە خوداکان ویستییان "نارسیس" زیندوو بکەنەوە، ئەمما نەک لە شێوەی مرۆڤێک، بەڵکە لە شێوەی گوڵی نێرگس دا."

لە دواییدا زانایانی دەروونشیکاری، ئەم جۆرە خۆشویستنەیان بە نەخۆشی خودپەسەندی(النرجسية) ناوبرد، هەروەها لە ئەدەبیاتدا 'نێرگس' بووەتە ڕەمزێک و مەبەستێکی قووڵ دەدات بە دەستەوە...

نێرگس لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، وەک ڕەمز بۆ چەند مەبەستێک بەکار هاتووە. "نەرگس بریتییە لە خۆشی و شادیی ئەنجامی زانست لە کردەوەدا "[1]

لە ئەدەبیات و شیعری فارسیش؛ نێرگس ڕەمزە بۆ چاو، چەند دەربڕینێکیشی بۆ بەکارهاتووە: ((دڵڕفێنی، مەستی، شۆخوشەنگی، بێئابڕوویی، خوماری، نەخۆشی، تەڕی، جادوو...))[2]. بێجگە چاو، لە شیعری فارسیدا هەندێ جاران نێرگس چوێندراوە بە چەناگە و ڕەنگی ڕووخسار[3].

لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، نێرگس لەو گوڵانەیە چوێندراوە بە ئەندامەکانی مرۆڤ. شاعیرانی کورد، هەندێ جار باڵای یارەکەیان و زۆرینەی جارەکانیش چاوی دڵبەرەکەیان بە نێرگس چواندووە. هەڵبەتە ئەم چواندنە هەر لە خۆڕا نەهاتۆتە ئارا، بەڵکە لەم نێوەندەدا پەیوەستییەکی فرە لە نێوان باڵا و چاوی دڵبەر و نێرگسدا هەیە، بەدەر لە نهێنی و ڕازەکانی پشتی ئەو ئەفسانەیەی کە باسمان کرد! کۆی شاعیرانیش

---

[1]. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، ل ٣٢١.

[2]. دکتر حمیرا زمردی، نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی، چاپ اول، چاپخانه دایره سفید، تهران، ١٣٨٧ هـ، ل ٢٩٠.

[3]. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٢٠٦، ٢٣٣.

لەم بەستێنە دەرنەچوون، ئەمەش بۆخۆی جێی سەرنجە! دەبێت بیرێکی کۆنتر و ئەندێشەیەکی کۆنتر لە پشت ئەم وێنانەوە هەبن...

مەلای جزیری لە بەیتێکدا دەڵێت:

"وان دەست و زەند و ساعیدان مەی دانە شێخ و زاهیدان

مەستی ب چەشمێ شاهیدان ئەو نێرگزا سیراب دا" (جزیری، ٢٠)

شاعیر لێرەدا چاوی یارەکەی بە نێرگس چواندووە و لە هەمان کاتیشدا پەسنی کردووە بەوەی تێراوە و شێخ و زاهیدانی مەست و سەرگەردان کردووە. لە نموونەیەکی تردا مەلای جزیری چاو دەکاتەوە نێرگس دەڵێت هیندە مەستن، سەرگران بوون:

"عەرعەران تا د شەپالن وەرقان جەزبەیە ڤێرا

نێرگزان سەر دگرانن، ل بنەفشان خەم و تابە" (جزیری، ٥٢٠)

نالی دەڵێت:

"هەناسەم زوڵفەکەی لادا و مەیلێکی نەکرد چاوی

نەسیم ئەنگوت و شەو رابورد و نەرگس هەر لە خەودایە" (نالی، ٤٦٣)

نالی دەڵێت چاوەکانی یارم نەپشکووتوون، هێشتا وەک نێرگسێکی کاڵ وایە و نەکراوەتەوە... لە بەیتێکی دیکەدا، هەمان تایبەتمەندی دەداتە پاڵ چاوی یارەکەی و بە نێرگسی کاڵ ناوی دەبات و دەڵێت:

"ئەو چاوە غەزالە فەتەراتی سەر وماڵە

ئەو نەرگسە کاڵە نە منی هێشت و نە کاڵا" (نالی، ٩١)

لەم نمونانەی خوارەوەشدا شاعیران چاویان بە نێرگس چواندووە:

"غوڵامی دیدەیی مەخمووری تۆیە، نێرگسی شەهلا

لە ئاب و تابی ڕووی تۆ داغدارە، لالەیی حەمرا" (سالم، ٨٤)

"راستە دڵ خەستە و بێ چارە وەکوو نەرگسی تۆ

نەرگسی مەستی ئەتۆ بەس نییە خوابێکی هەیە" (حاجی، ١٢٧)

"بە نەشئەی نێرگسی مەخمووری چاوی دڵبەرێ مەستم

هەمیشە بۆیە مەدحی نێرگسی شەهلایە گوفتارم" (کەمالی، ٧٣)

"ئەمن وەک پەرچەمی جانان، ئەمن وەک نەرگسی یارم

لەلایێ خاو و سەرگەردان، لە لایێ مەست و بیمارم" (وەفایی، ٣٥٩)

"دوو کەمانی ئابنوسی داوەتە دوو تورکی مەست

سوێند دەخوا؛ دوویان برۆ و دوو نەرگسی فەتتانمە" (ئەدەب، ١٧٢)

"وەکوو چاوی بە خوابی نێرگسی مەست
لە گوێدا وا گرانە وا نەخۆشە"        (کوردی، ١٧٦)

"چ حاجەت نەرگسی مەستت بکەم وەسفی بە مەخموری
کە چاوێ سورمە کێشراوی خودایی بێ، لە کل چ بکا"  (مەحوی، ٤٩)

"سۆفیی خەڵوەنشین بۆ نەزەرێکی گوڵی رووت
ڕەنگە وەک نەرگسی تەڕ چاوی سپی بێت و دەرێ    (نالی، ٥٤١)

"بە قەد سەروو، بە دەم غونچە، بە چاو نێرگس، بە ڕوو وەک گوڵ
سەراپا باغی حوسنی جانفزایی باغ و گوڵزارت"        (زێوەر، ١٣٥)

"تەماشای چاوی نێرگس کە بە مەستووری چ مەخموورە
تەماشای پێکەنینی گوڵ بە ئەحواڵی پەشێواوم"   (حەریق، ١٤١)

"هات، ئەمما چی هات؟! وەکوو گوڵ دەم لەبالەب پێکەنین

چوو، ئەمما چی چووە؟! وەکوو نێرگس دوو چاوی پڕ لە خەو" (بێخود، ٨٦)

"نێرگسی شەهلا کە مەشهوورە بە مەخمووری ئەبێ
دایما لەو چاوە کەسبی عیلمی بیماری بکا" (موختار، ٥٤)

"هارووتی دڵم هات و لە چاهی زەنەخت کەوت
سەرگەشتە لە دووی غەمزە بە دوو نێرگسی جادووت (وەفایی، ٥٩)

دەبینین لەم بەیتە شیعرانەدا، نێرگس و چاو یەک مامەڵەیان لەگەڵ کراوە و مەستی، مەخمووری، مەستووری، کاڵی، بیماری، خەواڵوویی، جادوویی...هتد، یەکێکن لەو پەسنانەی شاعیران بەکاریان هێناون...

لێرەدا باسێکی گەلێک گرنگ هەیە کە نیازی بەوەیە لە گۆشە و پەسارەکانی بەیتە شیعرییەکاندا، دەریبهێنین و بیخەینە بەر باس و روانینێکی ورد؛ ئەویش سپیبوونی چاوی شاعیرە وەک نێرگس! یان کاڵبوونەوەی چاوەکان و پەیوەندی ئەو ئەفسانەیەی "نارسیس"، بە عیرفانی ئیسلامی و شیعری شاعیرانەوە: ((کاتێ باسمان لە ئاوێنە کرد، ئەم ڕەنگدانەوەیە یەکسەر بیرمان بۆ ئەفسانەکەی نێرگس ڕادەکێشێ، بەڵام ئەم کێشەیە لە فیکری سۆفیگەرییدا کەمێ ئاڵۆزترە؛ کاتێ دونیا دەبێتە چاو و خودا لە مرۆڤی خۆیدا خۆی دەبینێ، ئەمە ئەو کێشەیە لێکدەداتەوە کە دڵی سۆفی، دەبێتە تاقانە

هەوارێک کە خودا دەتوانێ تێیدا نیشتەجێ بێ. لەم نیشتەجێبوونە، سۆفی "من"ی خۆی لە "ئەو"ی خودادا دەتوێنێتەوە. کاتێ کە نێرگز تەماشای "ئەو" دەکات، ئەم "سپی بووونی چاوە"، جگە لە مانای یەکەمی؛ مانای کاڵ بوونەوە و توانەوەش هەڵدەگرێ. لێرە هەست بە یارییەکی ئاوێنەیی ناکرێت لە نێوان "ئەو سەرووی نازە" و "نێرگس":

بە غەمزەی نازەوە ئەو سەروی نازە کەی چووە گوڵشەن

کە نێرگس وا بووە چاوی سپی، سەروی بووە تۆپاڵ

ئەم یاری ئاوێنەیە لە ئاستی کەونیشدا پیادە دەکرێت. جوانی زەمین ڕەنگدانەوەی دونیای باڵا و غەیبییە. ئەم درێژەپێدانەی کەونەش لە فەلسەفەی وەحدەتی وجوود بە جوانی ڕەنگ دەداتەوە...))[1]

ئەم چەند دێرەی سەرەوە کە وەرمانگرتووە؛ پەلکێشی چەند بابەتیکی ترمان دەکات کە ڕەنگبێ خۆی لە خۆیدا توێژینەوەیەکی سەربەخۆ و جیا بێت و نیازی بە کەرەستەگەلێکی تایبەت بێت، چون هەڵدەگرێت کە سەری لە عیرفان و تەسەوفەوە دەربچێت! هێندە دەڵێین کە 'نارسیس' لە ڕێی چاوەوە گرفتار و شەیدای خۆی بوو، ئەم چاوەیش لە عیرفاندا وێنەی 'حەق'ە. ئەم بەکاربردنە لە عیرفاندا خۆی خزاندۆتە ئەدەبیات و شیعرەوە، ئاشکراشە شاعیرانی کلاسیکی ئێمە میراتی شیعریان لە گەورە عاریفانی فارس و عەرەبی وەک: عەتتار و ئیبن عەرەبی و حەللاج و مەولانا و حافز و چەندانی دییەوە بۆ ماواتەوە...

[1]. ئەحمەدی مەلا، مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و سەرچاوەکانی عیشق و وێنەی مەعشوقدا، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ساڵی چاپ ٢٠١٣، ل ٣٣.

ئەو بەیتانەی باس لە چاو سپی بوون و کاڵبوونەوەی چاو دەکەن:

"هێند مونتەزیری تۆ بوو هەتا چاوی سپی بوو
نەرگس کە لەسەر یەک قەدەم و دیدە چەقیبوو" (نالی، ٣٠٩)

"بە غەمزەی نازەوە ئەو سەروی نازە کەی چووە گوڵشەن
کە نێرگس وا بووە چاوی سپی، سەروی بووە تۆپاڵ" (مەحوی، ٢٢٥)

"لە ناو باخا ئەبینم نێرگسی شەهلا ئەبم خۆشحاڵ
ئەشوبهێ چونکە شێوەیی نازی بە چاوی کاڵ" (کەمالی، ٧١)

بەدەر لە چواندنی بە چاو؛ نێرگس بە چەند بەکارهێنانێکی تریش هاتووە لای شاعیرانی کلاسیکی کورد، باڵای یار لە ڕێکی و ناسکی و شەنگیدا؛ وای کردووە بە نێرگس بچوێندرێتەوە، مەلای جزیری لە یەک-دوو نموونەدا ئەم بەکارهێنانەی هەیە:

"نەسبەت پەری زیبایە ئەو، وەک نێرگزا یەکتایە ئەو
یا من رای خلی فهل یشبی بشیء قامتا" (جزیری، ٤٤)

"ب خالێن وەرد و نەسرینان ژ قودرەت خەت کشاندی لێ
ب تەرحا نێرگزا عێلی سەحەرگاهان نەسیم لێ دا" (جزیری، ٦٩)

مەحوی شاعیر، جارێک نێرگسی وەک نیشانەی تێڕامان و بیرکردنەوە بەکارهێناوە[1]، لە بەیتێکدا مەحوی دەڵێت:

"تەڵێ نێرگسم و باغی حیرەتم پێ
بە فەڕ هات و وەکوو گوڵ زوو بەسەر چووم" (مەحوی، ٢٤٧)

ئەو شاعیرە کلاسیکییانەی تەمەنێکی زۆریان بەڕێ کردووە و وەرزی بەهاریان زۆر دیوە؛ غەزەلێکیان نووسیوە تایبەت بە بەهار و تەمەنی خۆیان! ئەم جۆرە غەزەلە لای نالی و وەفایی و حاجی قادر و هەندێک لە شاعیرانی تر دەبیندرێت، کە تێیدا گوڵەکان بوونیەت و پانتاییەکی زۆریان لە غەزەلەکەدا گرتووە، مەبەستی بەکارهێنانی چەمکی نێرگس تێیدا جۆراوجۆرە، واتا بۆ یەک مەبەست نییە وەک چاو، یان تەنیا پەسنێکی ڕووتی سرووشت! بۆ نموونە وەفایی قەسیدەیەکی هەیە و لە یەکەم بەیتدا دەڵێت:

"نەسیمی بادی نەورۆزی شەمیمی عەبهەری[2] هێنا
بەریدی عاشقان دیسان پەیامی دڵبەری هێنا" (وەفایی، ٤١)

لە قەسیدەکەدا، دوو بەیتی دیکەی تێدایە کە نێرگس بەکار دەهێنیتەوە:

[1]. بڕوانە دیوانی مەحوی، لێکدانەوەی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس و موحەمەدی مەلا کەریم. چاپخانەی تەفسیر، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٨، ل: ٢٤٧.
[2]. عەبهەر: نێرگس.

"لە بەزمی نێرگس و نەسرین بە دەفعی چاوەزاری گوڵ
وەنەوشە دەستە-دەستە عود و لالە مەجمەری هێنا"
لە مەیخانە چەمەن بەزم و تەرەبان گرت قەدەحنۆشان
شەقایق بادە، زەنبەق شیشە، نێرگس ساغەری هێنا" (وەفایی، ٤٣-٤٤)

یان بەیتی یەکەمی ئەم قەسیدەیەی حاجی قادر:
گوڕەی بەهارییە، ئێستێکە شاخ و داخی وڵات
پڕە لە لالە و نەسرین و نەرگسی شەهلا (حاجی، ٣٨)

زۆر جاران لە شیعرەکاندا بەر دیدەمان دەکەون کە نێرگس و گوڵەکانی تریش، تەنیا پەسنێکی ڕووتی سرووشتە و هیچ تایبەتمەندییەکی زیادکراوی نییە. بێ گومان ئەمە نابێتە ئەوەی شاعیر بە سادەنووس ناوزەند بکەین، وەلێ بەکارهێنانی ئەم هێمایانە لە شیعری کلاسیکدا و لە شوێنی خۆی، گەلێک پێویستن و گرنگن، چون خاراوی و وردیی شاعیر؛ لەسەر ئەو هێما و ڕمزانەوە بەندە...

شیعری کلاسیک پڕە لە، هێما، ئەفسانە، ڕەمز، ئوستوورە، دەستەواژەی عیرفانی، پەند... ڕەمزەکان بەشێکی زۆری شیعری کلاسیکی ئێمەیان پێک هێناوە و پانتاییەکی فرەیان لە نێو غەزەل و قەسیدەکاندا گرتووە. ئەگەر بێت و ئەم ڕەمزانە دەربکەین؛ لایەنی واتایی شیعرەکە زرِ و بێبەرهەم

دەبێت. بەکارهێنانی گوڵەکان، دارەکان، باڵندە و شوێنەکان... هەموو ئەمانە ڕەمز و هێمان کە شاعیرانی کلاسیکی ئێمە، بە وریایی و کونجوکۆڵییەکی زۆرەوە بەکاریان هێناوە و هیچ هەڵەیەکیان لەو بارەوە نەکردووە... دەبینین هێمای چاو، باڵا، تیرامان-کە لە ئەدەبیاتی فارسیشدا بە هەمان جۆرە-؛ لای شاعیرانی کلاسیکی کوردیش-ئەوانەی سەرتۆپن- زۆر بە وردی بەکار هاتووە! شاعیرانێکی وەک: جزیری و نالی و سالم و کوردی و مەحوی و وەفایی... کە لە شاعیرە پێشینەکانی ئێمەن؛ لایان نەداوە لەو داب و دەستوورەی کە هەبووە دەربارەی هێمای نێرگس. هەڵبەت بەکارهێنانی نێرگس لای ئەم شاعیرانە فراوانترە وەک لای شاعیرانی قۆناغی دواتر... گەر شیعری کلاسیکی دوای ئەو شاعیرانە بخوێنینەوە؛ دەبینین چیدی ئەم ڕەمزانە بەکارهێنانێکی وایان نامێنێت و بە یەکجاری لەگەڵ هاتنی لێشاوی مۆدێرنە، ئەم ڕەمزانە دەفەوتێن، وەک لە شیعرەکانی ناری، زێوەر، حەریق، قانع، سافی هیرانی، تاهیر بەگ...هتد، بەدی دەکرێن، یان تێکرا ئەم ڕەمزانە دەگۆڕێن لە ڕەسەنی خۆیان لادەدەن و وەک پەسنێکی ڕووتی سرووشت بەکار دێن، وەک لە هەندێک نموونەی شیعرەکانی حاجی و تاهیربەگ و موختاردا دەبینرێن. دواتریش لە ڕێبازی رۆمانتیکدا و لە دوای هاتنی سەدەی بیستەوە؛ شاعیرانی رۆمانتیکنووسی کورد، گرنگییەکی وایان بە ڕەسەنایەتی ئەو هێما و ڕەمزانە نەداوە و ئەگەریش بەکاریانهێنابێت؛ لە ئاگاییانەوە نەبووە، بەڵکە تەنیا لاساییکردنەوەیەک بووە...

چواندنی نێرگس بە چاو، ڕاستە تایبەتمەندییەکە لە شیعری کلاسیک و ڕەمزێکە لەوان، بەڵام ئاساییە گەر لە شیعری نوێدا بەکار بهێندرێتەوە و شاعیرانی تازەگەر و ئازاد، سوود لە نێرگس و لەو وێنە شیعرییە کلاسیکییانە وەربگرن. بۆ نموونە عەبدوڵا پەشێو کە یەکێکە لە شاعیرانی ڕێبازی ئازاد؛ ڕەمزی  نێرگسی بۆ چاو بەکارهێناوەتەوە و لە شیعرێکدا دەڵێت:

**شەو ڕاشکا،**

**ئەژنۆم شل بوو،**

**مانگ بە تاقی ئەسمانەوە هەڵپڕووکا.**

**ئەمشەو هاتووم**

**بۆ چنینی**

**چەپکە نێرگزێکی چاوت[1]...**

[1]. دیوانی عەبدوڵلا پەشێو،بەرگی یەکەم،  پشت لە نەوا، ڕوو لە کڕێوە، چاپخانەی ڕۆشهەڵات،  هەولێر، چاپی چوارەم، ٢٠١٦، ل،  ١٤٥.

# گوڵی سونبول

**"بە چین زوڵفت ئێحاتەی دا وەکوو سونبول لە دەوری گوڵ**

**بە موو هەر سوو، لە ڕێگەی موو، بە ڕووی دڵما دەکەی پەرژین"**

**"سالم"**

سونبول، سومبول، سۆنبول، یاخود؛ سمڵ و گیاپشیلەشی پێ دەڵێن. لە فارسیدا بە "سنبل، زمبل، زمبول"[1] هاتووە و لە زمانی عەرەبیشدا "السنبل" دەنووسرێت. ناوە زانستییەکەی "Hyacinthus"ە "گیایەکی بەهارییە، گوڵەکەی بچووک و بە شێوەی هێشووە"[2] گوڵەکانی ڕەنگاوڕەنگن و "دوای وشککردنەوەی عەتری لێ درووست دەکرێت، هەندێ جاریش وەک چارەسەر بەکاردێت"[3].

لە شیعری کلاسیکی کوردیدا؛ سونبول، بە شێوەیەکی گشتی؛ وەک ڕەمزێک و دەربڕینێکە بۆ قژ و مووی یار، چەند ناوێکیشی لەگەڵدا دێت: "زوڵف، توڕڕە، کاکۆڵ، پەرچەم، بسک، ئەگریجە، کەزی، گێسوو ..." ئەمانەش هەر مەبەستن لە قژ و مووی یار، وەلێ هەر ناوێکیان ئاماژەیە بۆ شوێنێکی مووی سەر. لە بەرانبەر هەر ناوێک لەوانە کە بەکار هاتووە؛ دەستەواژەیەک، یان وشەیەکی دی لە بەیتە شیعرەکەدا نووسراوە کە نیازە

---

[1]. فرهنگ لغت معین.
[2]. کەڵەفەرهەنگی رووەکە ئابوورییەکان، ل: ٢٦٠.
[3]. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

له بۆن و بەرامەی خۆش و دڵڕفێن، وەک: "مشک(میسک)، عەنبەر، عەتر، نافە... "، یان ناوهێنانی گوڵە بۆنخۆشەکانی تر لە بەیتەکەدا. مارف خەزنەدار لە فەرهنگی دیوانی نالیدا نووسیویەتی: "سونبول کینایەیە بۆ زوڵفی یار"[1] لەپاڵ ئەمەشدا سونبول لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بۆ خەت و خاڵ بەکار براوە. لە شیعری کلاسیکی فارسیدا؛ سونبول کینایەیە بۆ ''ئەبرۆ''،[2] ''زوڵف''،[3] لە هەمان کاتدا ڕەمزێکە بۆ " خەت و خاڵی ڕووی تازەجەوانان".[4]

ئەوەی وای کردووە ئەم چواندنە بێتە گۆڕێ، بە تێڕوانینی ئێمە چەند تایبەتمەندییەکن؛ گوڵی سونبول بۆنێکی خۆشی هەیە و وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا، بە وشککراوەیی دەکرێتە عەتر. لە هەمان دەمدا، شاعیران لە بۆن و بەرامەی زوڵف و مووی یار شەڵاڵ بوون و لێی بەهرەوەر بوون، نەیان ویستووە ئەم سەرچاوەی ئیلهامە فەرامۆش بکەن. شاعیران ویستوویانە ئەم بۆنی ئەگریجە و پەرچەمە، لە ئەندامێتی مرۆڤەوە بگوازنەوە بۆ گوڵێک لە گوڵە بۆنخۆشەکانی گوڵستان... نالی دەڵێت:

"شەو بۆیی سەری سونبولی زوڵفت لەسەری دام

ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەیی شەوبۆ" (نالی، ٣١٧)

---

[1].مارف خەزنەدار، فەرهەنگی دیوانی نالی، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی دووەم، هەولێر. ٢٠٠٨، ل: ١٠٠.

[2]. نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی، ل ٢٠٠.

[3]. هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢١.

[4]. دکتر غلامحسین رنگچی، گل و گیاهـ در ادبیات منظوم فارسی، چاپ اول، چاپ و صحفات بهمن، تهران ، ١٣٧٢هـ ، ل: ٢٢٢.

" ب سەروێ سونبولێن تاری، ب هەڤرا بازی و یاری

ب جۆدا خوون ببت جاری، ژ قەوسان گەزمەیان بەردە" (جزیری، ٥٠١)

"خوون و دل و جگەر دخوون نافەفرۆش هەر سەحەر

بادێ سەبا کو تێک بدات سونبولێ مشکسایێ زولف" (خانی، ٣٧٨)

"شەمیمی زوڵفت ئەورۆکە، نیشات ئەفزایە، وەک نافە

لە سونبول تەعبییەی بۆی موشکی تاتارت موبارەک بێ" (ئەدەب، ١٩٢)

"لە داغی سیلسیلەی تورەی نیگاری نازەنینی خۆم

ئەبێ تەرکی وەنەوشە و سونبول و هەم عەتر و عەنبەر کەم" (موختار، ٨٤)

بەدەر لە بۆن و بەرامەی زوڵفی یار کە تەمامان وابوو بیچوێنین بە گوڵی سونبول؛ خاڵێکی تری لێکچوو هەیە کە دەشێ هۆکارێکی تر بێت بۆ سازبوونی ئەم بەراوردکردنە، ئەویش پەخشانبوونی زوڵف و ئەگریجەی دڵبەرە بەدەم بای شەماڵەوە کە حاڵی شاعیر پەشێو و زاریی دەکات! چون گوڵی سونبولیش پەلک و لخ و گوڵی بەدەم باوە دەشنێتەوە و تەخشان و تا-تا دەبێت..

"داخۆ ئەمە ئەگریجەیە پەخشاوە بەسەردا
یا سونبولە کردوویە سەبا زوڵفی بە شانە" (مەحوی، ٣٠٠)

"بە سانی پەرچەمی ئاشوفتە سەرگەردان و ژۆلیدە
بە میسلی زوڵفی سونبول دڵ هەمیشە حاڵی شێواوە" (حەریق، ٢٠٣)

"عەرعەر عەدیلی قەدییە یەعنی بەرابەرن
سونبول شەبیهی زوڵفییە فەرقی نییە موێ" (نالی، ٥٨٠)

"من پەرێشانم لەبەر زوڵفت بە ڕوودا کەوتووم
زوڵف و ڕووی تۆ سونبول و گوڵ، یا کە نوور و زوڵمەتە" (وەفایی، ٢١٠)

"بە دەوری گەردنا پەخشان بووە کاکۆڵی تەڕڕاڕی
(سانرسەن بەرگی گویل ئوزر ئولینمیش) سونبول ئەفشانی" (کوردی، ٢٤٢)

"وەختێ کە لە ماڵ بێیتە دەرێ تورکی ستەمکار
ڕوومەت گوڵ و موو سونبول و قەد وەکوو عەرعەر" (زێوەر، ١٤٠)

"لە دەنگ و دووکەڵی شینی تفەنگی نیچیرەوان
میسالی سونبولی سوڵفیٚ کە تێک بچیٚ بە سەبا" (حاجی، ٤٠)

"حەقیانە کە چ بکەن تۆ بە زوڵفەینی چو سونبول
زوو سەید دەکەی ماهیی دەریا و نەهەنگ" (ئوشنوویی، ١٣١)

گوڵی سونبول، بە قەدی خۆیدا شۆڕدەبێتەوە و بەدەنی خۆی دادەپۆشێت، لێرەوە وێنەی تر بۆ شاعیر درووستدەبێت و لە زەینی هونەریی شاعیر خۆیدا، لێکچوونی دیکە دەخولقێت!! هەرچەندە جۆر و تۆوی سونبول زۆرە، بەڵام ئەوەی شاعیران لێی دواون و بەوە پەسنیان کردووە کە بە باڵای یاردا شۆربۆتەوە و وەک شۆڕابەیەک ڕووخسار و بەدەن و گەردەن و قامەتی یاری داپۆشیوە؛ ئەم جۆرەیانە. لێرەدا مادامەکی سونبول بە قەدی خۆیدا لە نشێویدایە و هێندە دێتە خوارەوە کە دامەن و قەدی دیار نامێنێت و دادەپۆشرێت؛ شاعیر لەسەر بینای ئەم وێنەیە دێت زوڵف و پەرچەمی یار بە باڵایدا دێنێتە خوارەوە وێنەی شیعری دەخولقێنێت... لەوەدا کە زوڵف بۆتە ڕێگر لەبەردەم بینینی ڕووخسار و جەبین و گەردەن و قامەتی یار؛ شاعیر دڵگرانە و داوا لە 'با'، یان 'یار' خۆی دەکات کە زوڵفی لابەرێت و نووری ڕووخسار و مانگئاسای هوەیدا بکات. لە شیعری کلاسیکدا، باڵای یار وەک خۆی نایەتە بینین، هەمیشە شاعیر زێدەڕۆییەکی فرە دەکات لە چواندنی باڵای یاردا، لە هەمان دەمدا دەبینین

شاعیر باڵای یار بە جۆرە درەختێک دەچوێنێت(نیهال، سەروو، نارەوەن، عەرعەر...)، یاخود بە گوڵ! لەم نموونانەوە زیاتر ئەو وێنانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

"تا سونبولی زوڵفت لە نیهالی قەدت ئاڵا
من دوودی هەناسەم گەییيە عالەمی باڵا" (نالی، ٨٩)

"قامەتی نارەوەنی گوڵشەنە، ئەما بە قیاس
سونبول و سۆسەن و گوڵ بەرگ و بەری نارەوەنێ" (ئەدەب، ١٩٩)

"ئەم جارە بە جارێ سەر و ماڵم چوو بە تاڵان
تا سونبولی زوڵفت بووە پەرژینی گوڵی رووت" (حەریق، ٢١٣)

"فیدای ئەو زوڵفە بم وەک سونبولی تەڕ سەر هەتا پێی تۆ
لە دەوری قامەتی سەرووت بە پێچ و حەڵقە ئاڵاوە" (موختار، ١٣٢)

"بە ڕوو گوڵ، پەرچەمی سونبول، دوو نێرگز وا لە ڕوخێتی
گوڵی ڕووخسارە، غونچەی لێوە، عەرعەر قەدی شۆخێتی" (سافی، ٨٧)

"با قیامەت ڕا نەبێ، با ڕۆژ نەگیرێ چاوەکەم!

توند مەبە! هەڵمەستە پێ، سونبول بە ڕووی گوڵدا مەدە!" (وەفایی، ٢١٥)

حاجی قادر بە جۆرێکی دیکە ئەم وێنەیەی سونبول بەکاردەهێنێت و لە بەستێنی یارەوە دەیگوازێتەوە بۆ سرووشت و داخ و ڕاخ:

"چیا لە تەوقەسەری دارڕژاوە تا کەمەری

چو زوڵفی سونبولی دەرهەم، چو پەرچەمی بەرِەزا" (حاجی، ٣٩)

بەدەر لەمانە، گوڵی سونبول، پێچ-پێچ خۆی دەردەخات و بە لوولی و چین-چینی زوڵف دەچێت، وەک سالم دەڵێت:

"وەھ لە پێچ و شکەن و نەفحەیی گیسوویی سیات

جەننەتیش بەم سفەتە سونبول و ڕەیحانی نییە" (سالم، ٥٣٧)

گوڵی سونبول وەک دیاریمان کرد ، چوێندراوە بە زوڵف. لە زۆر وێنەی شیعریدا کە سونبولی وەک ڕەمزێک تێدا بەکار هاتووە؛ دەبینین گوڵی تر لەو بەیتەدا بوونی هەیە، بەتایبەت چەمکی 'گوڵ' خۆی. لە پاڵ سونبولدا چەند گوڵێکی دیکەش چوێندراونەتەوە بە زوڵف و موو(لە بەشەکانی داهاتوودا بەسی دەکەین)، ئەم گوڵانە لەپاڵ سونبولدا بەژدار دەبن و بۆن

و بەرامەی کەزی و بسک و ژاکاوی و ژوولیدەیی ئەگریجە و گێسوو دەنوێنن. سالم دەڵێت:

"بەنەفشە کەوتە ژێر سونبول لەسەر گوڵ

کە تێکەڵ بوو لە سوبحا زوڵف و پەرچەم" (سالم، ل ٣١٠)

"لەو سەحەر جەولان ددت بایێ سەبایێ راست و چەپ

سوسەن و سونبول ب مەستی بێن سەمایێ راست و چەپ" (جزیری، ل١١٢)

لەو بەیتەی وەفاییدا بەنەفشە و لە بەیتەکەی جزیریشدا سووسەن، هەمان ئەرکی سونبولیان گێڕاوە و ڕۆڵی زوڵفیان بینیوە(لە بەشەکانی داهاتودا بە وردی لەسەر ئەو گوڵانەش دەنووسین)...

بەکارهێنانی سونبول وەک خاڵ[1]:

"کە خاڵ و پەرچەمی تۆم دی خەجاڵەت بووم وتم یاڕەب

لەناو باخا لەبەرچی سەیری سونبول بۆنی شەوبۆم کرد" (کەمالی ٦٣)

[1]. بۆ تێگەیشتن لە ڕەمزە عیرفانییەکانی وەک: خەت، خاڵ، چاو، زوڵف، ڕوو، لێو، بڕوانە لەپەڕە"٩٩"ی ئەم کتێبە.

# گوڵی ڕەیحانە

**"د سەردا ئەو مەها ئەنوەر، ژ رەیحان سونبولان دا سەر**

**کرم سەودا و هەم ئەبتەر، ژ من دل بر ب تالانێ"**

**"خانی"**

ڕەیحانە، یان ڕێحانە؛ گیایەکی یەک ساڵەیە و بۆنێکی خۆشی هەیە. "هەندێک دەڵێن کە بنەڕەتەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، یان بە درووستی هیندستانە."[1] ڕەیحانە لەو ڕووەکانەیە کە هەمیشە سەوزە و گوڵەکانی سپی و وەنەوشەیی و سوور و بۆنخۆشن. "لەلای پێشینەکانی یۆنان، بەهایەکی زۆری هەبووە و لە ئاهەنگەکانیاندا بەکاریان هێناوە."[2] "وشەی 'basilicum' لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە، بە مانای 'پاشا' دێت، چونکە زۆر پەسەند بووە لای پاشاکان."[3] لە فارسیدا "ریحان، سپرغم" و لە عەرەبیشدا بە "الريحان، سلطان الرياحين. ريحان الملك"، لە زمانی ئینگلیزیشدا بە "basil" هاتووە. "ڕەیحان لە پیشەسازیی عەتر و بۆندا زۆر بەکاردێت و بۆنێکی لێ درووست دەکرێت بە ناوی: essence of basilica."[4]

---

[1]. کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، ل ٢٣٠.
[2].سەروەر حەسەن، قورئان و ڕووەکناسی، چاپی یەکەم، چاپخانەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠١١، ل ٥٧.
[3]. کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، ل ٢٢٩.
[4]. محمد دریایی، پزیشکی موعجیزەئاسای ڕووەکی، وەرگێڕانی: گەشتیار مستەفا ئەمین، چاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١٦. ل ١٨٤.

لە زۆر فەرهەنگ و سەرچاوەدا، ڕەیحانە بەگشتی بە گیایەک وتراوە کە بۆنی خۆشە، بۆیە دەشێت کە ئەو ڕوەک و گوڵانەی کە خۆیان ڕەیحانە نین و بە ڕەیحانە نێویان دەبرێت؛ ئاسایی بێت. کوردەواری دەڵێت: ((گوڵ لە ڕەیحانە جوانترە، ڕەیحانە بۆنی خۆشترە.)) هەندێک جاریش ڕەیحانە نیشانەی ڕۆزی بووە لای موسوڵمانان: "عەرەب دەڵێت (خرجنا نطلب ريحان الله)، واتا چووینە دەرەوە بە دووی ڕۆزی خوادا."[1] ڕەیحانە لەچاو ڕوەک و گوڵەکانی تردا، لای موسوڵمانان پیرۆزترە، چون دوو جار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە و ناوی هاتووە، هەردوو جارەکەش بۆ بابەتی ناز و نیعمەت و ڕۆزی بووە(( وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ))،[2] ((فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ)).[3] "لە فەرهانگی کاوەشدا چەند واتایەکی بۆ دانراوە: "ڕووەکی ڕێحانە، هەر گوڵێک کە بۆنی خۆش بێت، بژێوی..."[4] هەر لە لای موسوڵمانەکان وا باوە لەناو خەڵکیدا کە بۆنی خۆشی ڕێحانە؛ ئارەقی پێغەمبەرە(ص).

بەوپێیەی رەیحانە بۆنێکی یەجگار خۆشی هەیە و هەندێ جۆریشیان ڕەنگەکەی ڕەشە؛ دەشێت کە شاعیرانی کلاسیک، هەمان مامەڵەی سونبول و وەنەوشە و سووسەنیان لەگەڵدا کردبێت و بە موو و زوڵفی دڵبەریان چواندبێت. لە شیعری شاعیرانی فارسدا "رەیحانە ڕەمزە بۆ زوڵف و موو".[5] بە هەمان شێوە؛ شاعیرانی کلاسیکی کورد، لە شیعرەکانیاندا

[1]. قورئان و ڕووەکناسی، ٥٨.
[2]. قورئانی پیرۆز، سورەتی 'الرحمن'، ئایەتی ١٢.
[3]. قورئانی پیرۆز، سورەتی 'الواقعه'، ئایەتی ٨٩.
[4]. فەرهانگی کاوە.
[5]. نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی، ل ٢٢٣.

رەیحانەیان لە شوێنی زوڵف بەکارهێناوە و هەمان تایبەتمەندی و پەسنیان بۆ داناوە:

"وەها لە پێچ و شکەن و نەفحەیی گیسوویی سیات
جەننەتیش بەم سفەتە سونبول و ڕەیحانی نییە"        (سالم، ٥٣٧)

"ڕەحان و سونبول تێ هەنە، سەد چیچەک و گول تێ هەنە
زەرباف و بولبول تێ هەنە، ئەو بەغچەیا گولزارێ خەت"    (جزیری، ٣٤٩)

"ڕەیاحین پەرچەم و لالە کولاە و یاسەمەن تورڕە
بەنەفشە خاڵ و نێرگس چاو و گوڵزار و سەمەن ساقە"    (نالی، ٣٧٥)

"تا کە لێم دوورە خەتی ڕەیحانیی ڕووی گوڵڕەنگی تۆ
کوێر بم ئەر بێم سەیری ڕەیحانە و گوڵی شەستپەڕ بکەم"    (کوردی، ٩٩)

"تەلیسمی بابلە، سیحری حەڵالە، ڕەنگی ڕێحانە
شکەنج و بەندە، یاخۆ جێ دڵانە زوڵفی سەر شانت"      (وەفایی، ٥٩)

"بۆ چمە میننەت لە ئاهووی کیشوەری چین و خەتا!
ڕایحەیی لەو طورڕەیی وەک مێشکی تاتارم بەسە"    (ئەدەب، ١٦٣)

"دڵم بۆ زوڵف و ڕووی جانانە ئەگری
مناڵە و بۆ گوڵ و ڕێحانە ئەگری"    (بێخود، ١١٨)

دەبێت بۆ تێگەیشتن لەو ڕەمز و هێمایانە؛ دووبارە بچینەوە سەر ئەفسانە و ئوستوورە. مرۆڤ تێدەمێنێت چۆن شاعیرانی کلاسیکی ئێمە لەو سەردەمەدا و بێ هیچ سەرچاوە و کتێبێکگەلێکی وا؛ ئەو هەموو مەعریفە و زانیارییەیان هەبووە!! ناوی ڕێحانە بنەچەیەکی تریشی هەیە و تێکەڵە بە ئوستوورەگەلێکی ئێرانی-یۆنانی. ڕێحانە گوایە باڵندەیەکی ئەفسانەیی بووە لە شێوەی نیوە مار و ئەژدەهادا، باڵدار و سەری شێوەی کەڵەشێر و کلکێکی درێژیشی هەبووە. ئەگەر سەرنج بدەین؛ چڵە ڕەیحانە، شکڵێکی هەیە دەچێتەوە سەر ئەو شێوە باڵندەیە و ئەو ڕازەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە گوڵی ڕێحانە پەیوەندییەکی ئوستوورەیی لەگەڵ ئەو باڵندەیەدا هەیە و ئەم ناوەی بەسەر گوڵی ڕەیحانەدا براوە؛ بۆ زەمەنێکی لەمێژینە و ئوستوورەیەکی دێرینە دەگەڕێتەوە، چونکێ باڵەکانی ئەو باڵندەیە لە پەلکی ڕیحانە دەکات و پۆپنەی باڵندەکەش کە لە شێر دەکات؛ لەو سەرپۆپەی ڕەیحانە دەچیت کە گرنج-گرنجە، تیکڕای چڵە ڕەیحانەکەش، لە شێوەدا دەچێتەوە سەر ئەو باڵندەیە..! ئێرە شوێنی ئەوە نییە بژاری دیوانە شیعرییەکان بکەین لە

ڕوانگەی ئوستوورە و ئەفسانەوە، چون ئەوە نیازی بەوەیە چەندان لێکۆڵینەوەی لێبکرێت و ئەو ڕەمز و هێمایانە کۆدەکانیان بشکێندرێت! ئەوەش بەبێ بوونی سەرچاوەگەلێکی زۆر، گەلێک قورس و  گرانە، وەلێ بۆ بەرچاوڕۆشنی، ئەوەندەی کە خوێنەر لێرەدا تێبگات؛ بابەتەکان درێژ دەکەینەوە و ئەو کورتکراوەی کۆمەڵێک  هەقایەت و ئوستوورە کە لە نەتەوەکانی تردا هەیە دەیخەینە ڕوو:

ئەم باڵندە ئوستوورەییە، لە نێو هەقایەت و داستانەکانی نەتەوە جیاوازەکاندا هەبووە، هاوشێوەی 'سیمورغ' کە ئەویش باڵندەیەکی ئەفسانەییە و لە شیعری شاعیرانی فارس و کورددا، شوێنی خۆی گرتووە. لە هەقایەتە ئوستوورەییەکانی یۆناندا، بە پاشای باڵندکان نێوی براوە و ئەو ناوەی کە پێشتر وتمان لە یۆنانییەوە وەرگیراوە، هەر لەم باڵندە ئەفسانەییەوە بەسەر گوڵی ڕەیحانەدا براوە.

هەندێک بۆچوونی تر هەبوون لەوەدا کە ڕێحانە لە ئەفسانە پێشینەکاندا بۆ چارەسەری ژەهراویبوون بەکارهاتووە، بە تایبەت بۆ مار و گیانەوەرە خشۆکەکان. لە ئەفسانەی باڵندەی ڕەیحانەشدا هەیە کە گیای ڕەیحانە بۆ چارەسەری ژەهری ئەم باڵندەیە بەکارهاتووە. لە ڕۆمانیا ڕەیحانە نیشانەی ڕقلێبوونەوە بووە، وەلێ هێشتا لە ئیتاڵیا کچان چڵە ڕێحانە دەدەن لە زوڵف وگێسوویان، دیارە ئەمەش دەبێت بچێتەوە سەر حەکایەتێکی کۆن...

ئەوەی ئێستا ماوە بیڵێین و جێی تێڕامان بێت، ئەو بەیتە شیعرانەن کە لەگەڵ ناوی ڕەیحانەدا، مار هاتووە و هەردوکیان کینایە و ڕەمزن بۆ زوڵفی یار!! ئەم بەکارهێنانە هەروا لە خۆڕا نەبووە!:

"فەتلێ سیاهـ ماری شەڤین، ریحان ب دور سەروان چەڤین

ئاخر ب سەلوێدا رەڤین، خەف بوون د تایێ چەنبەرێ" (جزیری، ٥٩٥)

"بەسەر نەیدا مەگەر زنچیرە، یا زونارە، یا مارە

لە نەخلی قامەتت ئاڵاوە یاخۆ زولفی ڕێحانی" (وەفایی، ٣٣١)

لە شیعری فارسیشدا کە پێش ئەدەبی ئێمەن؛ هەمان وێنە دەبیندرێت:

**"گیسوی من به سوی من ندو ریحان است**

**گر به چشم تو همی تافته مار آید"** (ناصر خسرو، ص ١٦٢)

ڕەیحانە جارێک لای مەلای جزیری بۆ باڵای یار بەکارهاتووە، دیارە ئەمەش لەبەر چەند تایبەتمەندییەک بووە. ڕێحانە جۆری هەیە بە نزیکەیی بەقەدەر باڵای یار بەرزدەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێحانە ناسک و خۆشڕووە و بنیادەم بە دیتنی ڕۆحی دەبزوێت:

"مەشی مەستانە ڕەیحانی دلێ من دی د ئامانجێ

ڕەشاندی سینەیێتیران ب قەوسێ هەردومال ئەبروو" (جزیری، ٤٩١)

ڕەیحانە لە بەیتەکاندا، پاڵی داوەتە چەند گوڵێکی دیکە و شاعیران بەیت و غەزەلەکانی خۆیان کردووەتە گوڵستان و هەر گوڵێکیشیان بە ئەندامێکی چواندووە! ڕەیحانە هاوڕێیە لەگەڵ سونبول و وەنەوشە و سووسەن لە پەسنی کەزی و گێسووی دڵبەردا:

"سونبول کەملاندن گول و لالە خەملاندن

ڕەیحان شەتلاندن ل روخان تازە بنەفش هات" (خانی، ٣٥٧)

"سەد قتوو ئەنواعی عەتری سەد لە شووشەی پڕ گوڵاو

سەد چەپک خونچە و وەنەوشە و نێرگس و ڕێحانە هات" (ناری، ٧٩)

"نامەوێ باغی وەنەوشە و سونبول و ڕەیحان و گوڵ

خونچەیی لێوی نەبێ، باخی گوڵانم بۆ چییە" (سافی، ٦٨)

"ڕەیحانی"، خەتێکە لە خەتەکانی نووسین، کە لە کۆن و لەپاڵ چەند جۆرە خەتێکی تردا، شاعیران شیعرەکانی خۆیانیان پێ نووسیوەتەوە و جوانیی برۆ و زوڵف، خەت و خاڵ، لێو و ڕووی یاریشان پێ چواندووە:

"پێم بڵێ: یاقووت و ڕێحان خەتتی کامیان خۆشترە؟

وا عەیارە چاوەکانی، لەعلی خەندانم مەکە" (وەفایی، ٢٣٥)

"د دیداریٚ، تە رەفتاریٚ، تە ئەلماسێن شەکەرباریٚ

ب عەینی ریٚ ل سەر سادان، دو نوون رەیحان نومان ئەبروو" (جزیری، ٤٩٥)

"رەیحانی و دیوانی و هەم سولس و موسەلسەل

یەک-یەک وە هەزار رەنگیٚ ژ حوسنیٚ نەقشاندن" (جزیری، ٤٧٧)

بەکارهێنانی ڕەیحانە وەک ڕەمزێک بۆ خەتی دڵبەر:

"بیٚ خەتت مومکین نییە دڵ دەم بە ڕێحانەی بەهەشت

بیٚ گوڵی ڕووت کەی تەماشای لالەیی حەمرا ئەکەم " (کەمالی، ٧٩)

# گوڵی لالە

**"لالە ڕوخسارم لە سایەی ئەشکی خوێنین ڕەنگەوە**
**چونکە ڕووسوورم لە قاپی عەین و شین و قاف و تێ"**
**"مەحوی"**

گوڵی لالە لەپاڵ گوڵی نێرگس و سونبولدا ، زۆرترین جار بەکاربراوە لە شیعری شاعیرانماندا، دیارە ئەمەش پەیوەستە بە چەند تایبەتمەندییەکی وێنەیی، ئوستوورەیی و ئەفسانەییەوە. گوڵی لالە، لە زمانی کوردیدا بە زۆر ناو هاتووە؛ بێ لەوەی لالە خۆی چەندین جۆری هەیە و لە هەر ناوچەیەکی دونیاشدا شێوەیەکی وەرگرتووو... "لالە، گوڵاڵەسوورە، گوڵی نیسان؛ گیایەکی بچووکە، بە زۆری لە جێگەی تەڕ و ناو شاخ و قەراغ ئاو دەڕوێ، کێوی و ماڵی هەیە، هەروەها لە ڕووی ڕەنگ و ژمارەی پەڕیەوە جۆری زۆرە، کێوییەکە ڕەنگی سوورە، لە ژێر پەڕەکانیدا لەککەیێکی ڕەش هەیە."[1] "نزیکەی '١٢٠' جۆر لە گوڵاڵەسوورە هەیە، ئەم گوڵانە سەر بە کۆمەڵەی خشخاشن، گوڵەکانیان بە شێوەی تاک و هێشوون."[2] لالە، ئەم ناوانەشی پێ دەوترێت لە زمانی کردیدا: " ئالالە، هەڵاڵە، باتینۆک،

---

[1]. مارف خەزنەدار، فەرهەنگی دیوانی نالی، ل ١٤٢.
[2]. کەڵەفەرهەنگی گوڵە ئابورییەکان، ل ٣٦٥.

بووک، بووکوزاوا، پاگورگانە، چارەچەقیلە، ڕەبەنۆک، کولیلکانیسانێ، گۆرالەقلیان، گوڵاڵە، گوڵاڵەسوورە، گوڵەمانی، گوڵەنەورۆز، گوڵەمێلاق، گوڵەمێلاقە،، گوڵە شیلانە..."[1]

لە زمانی فارسیدا "لالە، شقایق"ی پێدەڵێن، لە زمانی عەرەبیشدا "شقائق نعمان، ورد نیسان، کف الصبع" هاتووە. بە ئینگلیزی ئەم ناوانەی هەیە"wind flower, anemone, ranunclus" بە لاتینیش "Anemone"یان پێ وتووە. لالە زۆرینەی ئەو جۆرانەی کە هەیە گوڵەکانی سوورن، بۆیە ئەو وشانەی لەگەڵیشدا دێت لە شیعرەکاندا، هەمان واتای سووریان هەیە: لالەی حەمرا، لالەی داغدار، جگەر، دڵ، سینە، لێو، ڕوو... وشەی 'لەعل" کە وەرگێراوی زمانەکانی ترە؛ بە واتای بەردێکی سووری بەنرخ دێت کە وەک یاقووت وایە. لە زمانی عەرەبیدا وشەی 'لعل'مان هەیە کە لە بنەڕەتدا وشەی 'لال'ی فارسی بووە و بە لێکردنەوەی ئەلفی ناوەڕاست'ا' و دانانی 'ع' لە شوێنیدا؛ بە عەرەبی کراوە، هەروەک وشەی فارسی 'کاك' کە بووەتە 'کعك' لە عەرەبیدا.[2] لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بڵێین کاک؛ وشەیەکی کوردییە و پاشان چۆتە زمانی فارسییەوە و دواتریش عەرەبی...

---

[1]. فەرهەنگی کاوە.

[2]. بڕوانە کتێبی: گل و گیاه در ادبیات منظوم فارسی، ل ٣٧٣.

لای شاعیرانی فارس، لالە نیشانە بووە بۆ ئەم مەبەستانە: "ڕووناکی، تەڕی، خۆڕسکی، کاسەگرتن، بێبەشبوون، داخداری، دڵی خوێناوی، ئاگرین، ڕووسووری، دەمکردنەوە، بێئاگایی، دڵڕەشی..."[1]

لە شیعری شاعیرانی فارسدا؛ لالە ڕەمزێک بووە بۆ "ڕوو، بناگوێ، پەنجە، خاڵ، دەست، زمان، دەم، لێو، گوێ".[2] بە هەمان شێوە گوڵی لالە بەکارهێنانی زۆر هەبووە لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کورددا. لالە لەبەر ڕووە سوور و جوانەکەی؛ شاعیران دڵبەرەکانی خۆیانیان پێ چواندووە، لێرەدا 'ڕوو و ڕوومەت'ی یار بە لالە چوێندراوە:

"غوڵامی دیدەیی مەخمووری تۆیە، نێرگسی شەهلا

لە ئاب و تابی ڕووی تۆ داغدارە، لالەیی حەمرا" (سالم، ٨٤) ڕوو

"دەسووتێ دڵ لە داغی لالەیی ڕووت

فتیلەی عەشقە بۆ شەمعی مەزارم" (کوردی، ٨٣) ڕوو

"ڕوو و خاڵی ڕەونەقی لالە و وەنەوشەی ساندووە

لالە داو وا وەنەوشەش بۆیی هەر ماتەم دەکا" (سافی، ١٨) ڕوو

---

[1]. کتاب 'نمادها' نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی، ل ٢٨٤.

[2]. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٢٢٨-٢٤٢.

"ئەی بولبول تۆ عاشقی ڕووی گوڵی سووری
من عاشقی ڕووی گوڵێکم لالە عوزارە"   (ئوشنوویی، ١٠٦)

"لالە داغە، غونچە دەردە، پێ لە خاکا ماوە سەرو
تا موشەڕڕەف بوو چەمەن بەو ڕوومەت و لێو و قەدە"   (مەحوی، ٢٩٤)

"کوڕ، یا کچی لالە ڕوو، شیرینە بەمە هەردوو
"وەک نوقڵی موهاننا کوڕ، وەک شەهدی موسەففا کچ"   (ئەدەب، ٨٢)

"پارە بوو سەد دڵ بە نوکی نەشتەر و خاری جەفا
داخی زوڵفت وا بە لالەی ڕوومەتی ساداتەوە"   (ناری، ٢١٥)

"حەڵقەی سەری زوڵفت لە دوو لا چەتری عیزارن
دەوری وەرەقی لالە و گوڵعەنبەری خامە"   (وەفایی، ٢٤٠) روو

"چاوەکەت بۆ من لە باتی نێرگسی شەهلا بەسە
سەیری ڕوخسارت لە باتی لالەیی حەمرا بەسە"   (زێوەر، ١٨٠)

"پارە بوو سەد دڵ بە نوکی نەشتەر و خاری جەفا
داخی زوڵفت وا بە لالەی ڕوومەتی ساداتەوە" (ناری، ٢١٥)

"بێ خەتت مومکین نییە دڵ دەم بە ڕێحانەی بەهەشت
بێ گوڵی ڕووت کەی تەماشای لالەیی حەمرا ئەکەم " (کەمالی، ٧٩)

"لاڵە بێ لالەی ڕوخت "مەحوی"، وەکوو مورغی خەمۆش
مەر بە چاکی سینە وەک گوڵ شەرحی دووری کا، سەنەم" (مەحوی، ٢٦١)

لە هەندێ نموونەدا شاعیران ڕووی خۆیان بە لالە چواندووە، دیارە ئەمەش زۆرینەی لەبەر گریانی شاعیرەکان بووە لە دووری و حەسرەتی یاردا:

"لالە ڕوخسارم لە سایەی ئەشکی خوێنین ڕەنگەوە
چونکە ڕووسوورم لە قاپی عەین و شین و قاف و تێ" (مەحوی، ٣٤١)

"نە داغی جەرگی خۆم زانی، نە مایەی بەرگی خوێنینم
شەهیدی دەشتی عیشقم، لالە ڕەنگم، من کەڕ و لاڵم" (وەفایی، ١١٤)

"وەک گوڵ جگەر بە خوێنم و وەک لالە، دڵ بە داغ
بۆ سیپی ڕووت، شەقایقی ڕووم، ڕەنگی بوو بە بەی" (کوردی، ٢٥١)

"نالی وەکوو لالە کە شەهیدی غەم و داغە
لەم باغە بفەرموو کە ئەویش لێرە دەنێژم" (نالی، ٢٢٧)

"چێهرەم کە پێش ئەزین بە سەفا ڕەنگی لالە بوو
ئێستێ دەبا لە حینی خەزانا گرەو لە بەی" (سالم، ٥٧٢)

بەکارهێنای لالە وەک لێو و دەم:

"ڕوومەتی ڕەخشانە، یا ماهی درەخشانە، یا
لەعلی بەدەخشانە، یا لالەیی لێوی حەبیب" (ناری، ٧٥) لێو

"دەم؛ تازە شکۆفێکی شەقایق لە نساران
لەب؛ پڕ لە تەبەسسوم، بە نەسیمی دەبەهاران" (ئەدەب، ٩٩)

بەکارهێنانی لالە وەک خەت و خاڵ:

"وەکی ئەو تێنە سەر بالان، ببینن نوقطە و خالان

بنەفش و تەرحێ ئالالان، د سەر ماهێ تابانێ" (خانی، ٤٠٩) خاڵ

"چەمەن لە لالە میسالی خەتی ڕوخی دولبەر

سیاە چادری لێ بۆتە خاڵی سەر گۆنا" (حاجی، ٣٩) خەت

بەکارهێنانی لالە وەک چاو:

"دیدەت وەکو گوڵ سورە، پڕی شەبنەمی ئەشکە

یا لالەیی پڕ ژاڵەیە دوو نەرگسی شاهلات؟" (نالی، ١٠٩)

"دوو دیدەیی نێرگسینی پڕ لە لالەم

لە دەوری لێوی ئەو چاو جوانە ئەگری" (بێخود، ١٢٠)

بەکارهێنانی لالە وەک بەدەن:

"لالەن بە بەدەن ئەتڵەسی ئەخزەر کە لەبەر کەن

نەورەستە گوڵن، بەستە لەگەڵ دەستە گیاهن" (نالی، ٢٨١) بەدەن

"تۆ هاتییە گوڵشەن بە سەرو و زوڵفی بڵاوت

زۆری پێ نەچوو ڕۆیی لە چەمەن، لالە لە داغان" (وەفایی، ١٥٢)

بەکارهێنانی لالە وەک کڵاوی سەری مرۆڤ:

"نەرگس نیگەە و ساق سەمەن و کورتە بەنەفشەن

موو سونبول و ڕوومەت گوڵ و هەم لالە کولاهن" (نالی، ٢٧٩)

"ڕەیاحین پەرچەم و لالە کولاە و یاسەمەن توڕڕە

بەنەفشە خاڵ و نێرگس چاو و گوڵزار و سەمەن ساقە" (نالی، ٣٧٥)

دەبینین لە شیعری شاعیرانی کلاسیکماندا، لالە چوێندراوە بە چەند ئەندامێکی مرۆڤ"ڕووخسار، لێو، گۆنا، بەدەن، چاو، کڵاو"، وەکوو خەت و خاڵی دڵبەریش بەکار هاتووە. بۆ لەمانە؛ لالە بۆ داغداری دڵ و سینە و دەروون و جگەری شاعیر خۆی بەکارهاتووە:

"لە باتی لالەیی حەمرا، جگەر پوڕ داغی خورشیدە

لە باتی سونبولی تاتا، سەر و سەودا پەرێشانە" (نالی، ٤٠٨)

"بە میراتی لە دڵمۆ داغی ڕەش بۆ لالە جێ ماوە
کە وەقتێ سەوز ئەبێ ئەو بۆیە وا ناوجەرگی سووتاوە" (موختار، ١٣٢)

"لە باتی لالەیی حەمرا، جگەر پوڕ داغی خورشیدە
لە باتی سونبولی تاتا، سەر و سەودا پەرێشانە" (جزیری، ٢٧١)

"دڵ لە داغت ئەی سەنەم وەک لالە بۆتە جامی خوێن
خوێنی من ئەنگوشت نوما بێ چاکە یا ڕەنگی حەنا" (حەمدی، ٢٤٢)

"لالەش وەکو من سینەیی پڕ حەسرەت و داخە
تا دیویەتی ڕوخسارەیی گوڵ بۆیی موحەمەد" (حەریق، ١٣٩)

"بۆ لالەیی نوعمانت، داغدارە دڵ و جەرگم
داغدارە دل و جەرگم، بۆ لالەیی نوعمانت" (بێخود، ٢٩)

"وا تێمەگە گەر هەیکەلی من زاهیری ساغە
وەک لالە دەروونم هەموو لەو هیجری تۆ داغە" (ئوشنوویی، ١٢٦)

ڕەنگبێت کاتی ئەوە هاتبێت کە گوڵ تێکەڵ بە ئووستووره و ئەفسانەکان بکەینەوە و بزانین ئەوان چییان لە پێیە و چیمان پێدەدەن. ئایا ڕەنگی سووری لالە لە ئەفسانەکاندا بۆچی دەگەڕێتەوە؟ لەم بارەوە چەندین ئوستووره و ئەفسانە گێڕدراونەتەوە:

لە ئەفسانەیەکدا هاتووە؛ کاتێک ئادەم لە بەهەشت دەرکراوە و هاتۆتە سەر زەوی، لە حەسرەتان گریاوە و هێندە فرمێسکی ڕشتووە، تا ئەوەی فرمێسکەکانی بوونەتە خوێن و کاتێک کەوتوونەتە سەر زەوی؛ گوڵی لالە لەجێی ئەو فرمێسکانە ڕواوە![1] لە ئەفسانەی لەیل و مەجنونیشدا لالە ڕۆڵی خۆی هەیە و ئاماژەیە بە دڵی خوێنینی مەجنون کە لەبەر لەیلی خوێنی ڕژاوە.[2]

ئوستوورەیەکی کۆنی یۆنانی هەیە کە باس لە 'ئەدۆنیس' و 'ئەفرۆدەیت' دەکات، گوایە 'ئەدۆنیس' لاوێکی جوانخاس بووە و کیژان شێت و شەیدای بوونە، تا ئەوەی لەگەڵ 'ئەرفرۆدەیت' کە خواوەندی جوانی بووە، دەست تێکەڵ دەکەن و دەبنە دڵداری یەکدی. ئەمەش قین و خەشمی 'ئیروس'ی خواوەندی جەنگ هەڵدەستێنێ و ئەم قین و ڕقە بە کوشتنی 'ئەدۆنیس' کۆتایی پێ دێت. لێرەوە هەر دڵۆپە خوێنێک کە لە برینی 'ئەدۆنیس' دەتکێت؛ دەبێتە گوڵی لالە...[3] بە هەمان شێوە ئەفسانەیەکی

---

[1]. دکتر محمد جعفر یاحقی، فرهنگ اساطیر و داستان وارەها در حدبیات فارسی ، چاپ چهارم، جاپخانه فرهنگ معاصر، تهران، س: ١٣٩١، ص: ٧١٧.
[2]. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٧١٧.
[3]. بڕوانە: **خدایان باستان**

ترمان هەیە کە باس لە مردنی سیاوەش دەکات و دەڵێت؛ ئەوکاتی سیاوەش گەردنی بە تیغی شیری ئەفراسیاب دەبڕدرا؛ گوڵی لالە شاهێدی ئەو ماجەرایە بووە و لەو دەمەوە سەری بەرەو ژێر ناوە و ئەشک دەڕێژێت، 'لالەواژگون' یان ' لالە نگونسار' لێرەوە هاتووە و تەنانەت بە ناو گوڵی سیاوەشیشەوە ڕۆشتووە.[1] لە بەرانبەر ئەم ناوەدا کە لە فارسیدا هەیە، لە کوردیشدا "سەرنەخوونک، شلێرە" هاتووە... لە ئەفسانەی شیرین و فەرهاددا؛ دووبارە ئەم وێنانە دەبینینەوە کە لالە لە ڕژانی خوێنی فەرهادەوە ڕواوە و ئەم وێنایە لە ئەدەبیاتی فارس و کورددا بە شێوەیەکی زۆر ڕەنگی داوەتەوە.

"گوڵ و لالەی کەژ و کۆ، کۆهکەن دێنێتەوە فیکرم

کە خوونی ناحەقی ئەو مەوج ئەدا ئێستەش لە کێو و شاخ" (مەحوی، ١٣٨)

"بێستوون ئێستەش کە وەقتێ لالەیی لێ سەوز ئەبێ

باسی خوێنی دیدە و داغی دڵی فەرهاد ئەکا" (موختار، ٥٥)

"زحسرت لب شیرین هنوز می‌بینیم

کە لالە می‌دمد از خون دیدۀ فرهاد" (حافز، غزل ١٠١)

---

https://ancientgodsblog.wordpress.com/2013/11/19/آدونیس-adonis/

[1]. ویکیپیدیا، دانشنامه آزاد.

کێ لە گوڵزاری نیشاتا گوڵبونی شیرینی ناشت"

ئەو لە کۆساری غەما فەرهادی کردە لالەنێژ" (مەحوی، ١٧٥)

"گوڵاڵەی بێستوون ئێستەش بەهاران

ئەڵێن پێت ماجەرای فەرهاد و شیرین" (موختار، ١٠٩)

ئەوەندەمان لێ ئاشکار بووە کە ئەفسانەکان هەموویان باس لە خوێن و ئەشک دەکەن، هەموو سەرچاوەکانیش ئاماژە بۆ ڕەنگی خوێن و لالە دەکەن. لالە پەڕیوەتە نێو ئەدەبیاتی عیرفانەوە و لەبەر ڕەنگ سوورییەکەی؛ بە ساغەر و جام و بادە چوێندراوە، ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی مەبەستە لە داغداری و میحنەت و مەینەتیی، لەگەڵ ئەوەشدا هێما بووە بۆ دڵی شاعیر، چونکە دڵی شاعیر شوێنی کەشفکردنی حەقیقەت و ئاشنابوونە بە ڕازی ئیلاهی...

"لە مەیخانەی چەمەن بەزم و تەرەبیان گرت قەدەحنۆشان

شەقایق بادە، زەنبەق شیشە، نێرگس ساغەری هێنا" (وەفایی، ٤٤)

# گوڵی وەنەوشە

**"ملی کەچ کرد وەنەوشە، کەوتە بەر پێت وەک قەباحەتبار**
**کە دەرکەوت خاڵی لێوت تێگەیی شێت و خەتابارە"**

**"موختار"**

وەنەوشە، گیایەکی تەمەندرێژە، قەدەکەی هەتا ڕادەیەک قایمە، گەڵاکەی لە شێوەی دڵدایە. گوڵەکانی بۆنخۆشن و ڕەنگیان وەنەوشەییە.[1] ڕووەکێکی پزیشکییە و لە چارەسەرە پزیشکییەکاندا بەکاردێت و نزیکەی سەد جۆری هەیە. " بنەوشە، گیایەکی کورتە، لقی باریک و گوڵی وردی بچووکی هەیە، ڕەنگی شین یان زەردە. لە بەهاراندا لە پێش هەموو گوڵێکی تردا پەیدا دەبێت."[2] لەبەر ئەمەشە کە دەڵێن وەنەوشە مژدەی بەهاری پێیە. وەنەوشە لە هێماگەریدا؛ هێمایە بۆ ئەندێشە و تێفکرین، چونکە ئەم گوڵەکەی پێنج دانەیە و ژمارە پێنجیش ئاماژەیە بۆ تایبەتمەنتییەکی تایبەتی مرۆڤ کە ئەندێشەیەتی. واژەی (pensee) لە زمانی فەڕەنسیدا دوو واتای هەیە؛ وەنەوشە، ئەندێشە![3] لە هەمان کاتدا؛ وەنەوشە گوزارشت بووە لە ڕکوع و سوژدە، لە سەردەمی مەسیحییەتیشدا هێما بووە بۆ شەرمنی و بێ

[1]. کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، ٤٤٩.
[2]. مارف خەزنەدار، فەرهەنگی دیوانی نالی، ل ٣٣.
[3]. ژان شوالیە - الن گربران، فرهنگ نمادها، ترجمە: سودابە فضایلی، چاپ: دوم ، انتشارات جیمون، تهران، ١٣٨٤هـ، جلد دوم، :ص ١٢٠.

فیزی.[1] ڕەنگی وەنەوشەش، ڕەنگی بەرزییە، پەڕی گوڵەکانی بەوە ناسراوە کە زۆر نەرمە، هەروەها بۆنی گوڵی وەنەوشە بۆنێکی تایبەت و لەبەردڵانە و مەردووم پێی گەش دەبێت، هەموو ئەم نەرمی و بۆنخۆشی و بەرزییەی گوڵی وەنەوشە؛ وایکردووە شاعیران بەکاری بێنن و سوود لە هێماگەری و ڕەمزی وەنەوشە وەربگرن...

ناوی وەنەوشە لە زمانی کوردیدا بە چەند چەشنێکی تر هاتوو، لەوانە: (بنەفش، بنەوشە، بەنۆش، بەنەفشە، منەوشە، مەنەوشە، وەنۆشە، وەنەوش...)[2] لە زمانی فارسیدا "بنفشە" و لە عەرەبێشدا "بنفسج" و لە ئینگلیزیشدا "violet". بە لاتینی "viola odorate"یان پێ وتووە. لە پەهلوی کۆنیشدا بە "vanafšak" هاتووە..

لە ئەدەبیات و شیعری شاعیرانی فارسدا؛ ڕوانی وەنەوشە، بەواتای هاتنی بەهار هاتووە و ڕەمزێکیش بووە بۆ: زوڵف و گێسوو،[3] خەت و خاڵ و بنی نینۆک![4] لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کورددا؛ وەنەوشە چەند بە مەبەست و ڕەمزێک بەکاربراوە، هەندێکیان ڕاستەوخۆ پەیوەندییان هەیە بە وێنە و تایبەتمەندی گوڵی وەنەوشەوە، هەندێکی تریشیان دەچنەوە سەر بیروباوەڕی ئوستوورەیی و ناراستەوخۆ شتێکیان لێ شین دەبێت. هەڵبەتە دەبێت ئەوەش بڵێین کە بەداخەوە ئەو ڕەمز و هێمایانەی لە کەونارەوە بەکاربراون، ئێستێ گەلێک کەمبوونەتەوە و دەشکرێ بڵێین هەر

[1]. دکتر محمد جعفر یاحقی، فرهنگ اساطیر و داستان واره ها در ادبیات فارسی، ل ٢١٧.
[2]. فەرهەنگی کاوە.
[3]. گل و گیاه در ادبیات منظوم فارسی، ل ٦٠.
[4]. نمادها و رمزهای گیاهی در ادبی شعر فارسی، (خط) ل ٢١٠، (ناخن) ل٢٤١.

نەماون. لەو نموونە شیعریانەی کە وەنەوشەی تێدایە و یاریش بوونێکی هەیە؛ شاعیران وێنەیەکی جوانیان خولقاندووە، بەوەی کە پێشتر وتمان وەنەوشە لە هێماگەریدا، ڕەنگەکەی هێمایە بۆ بەرزی و گەردن بڵندی، بەڵام شاعیران لەو ساتەیدا کە یار دەچێتە گوڵزار و گوڵستان؛ گەردنی وەنەوشە دەشکێنێن و لە بەرزی و بڵندی خۆی دەخەن و سەری پێ شۆڕ دەکەن، چون دڵبەری دڵڕفێنی شۆخ و شەنگ، تەشریفی هێناوەتە نێو باغ، بۆیە وەنەوشە حەددی نییە لە ئاستی ڕووگوڵی یاردا سەری هەڵبڕێت!! وەنەوشەیەک بەو جوانییە بێ مانەندەیەوە، دەبێ مل کەچ بکات و خەم ببێت، بڕواننە ئەم نمونانە کە تێیدا وەنەوشە لەبری خەت بەکاربراوە و گەردنکەچیشی پێبڕاوە:

"لەسەر سەبزەی چەمەن، یاری سەهیقەددم کە جیلوەی کرد

لە سەجدەی خاڵی لالێوی بەنەفشە گەردەنی خەم بوو" (سالم، ٣٩٠) خاڵ

"خەندەی لەب و عەبیری خەتی تۆ بوو وەک مناڵ

تۆوی تکا کە غونچە، وەنەوشە ملی شکا" (مەحوی، ٥٤) خەت

"لە شەرمی خاڵی ژێر پەرچەم، وەنەوشە گەردنی کەچ بوو

وەکو موجریم خزایە سێبەری بن باڵی شەوبۆوە" (حەمدی، ٢١٠) خاڵ، کەچ

"چوویتە ناو باخ و ئەمرۆ بێچارە وەنەوشە بوو خەجڵ
گەردنی کەچ کرد بەرامبەر وردەخاڵی شینی تۆ" (کەمالی، ٩٨)

"خەت و زاری کە باسی کەوتە گوڵزار
کەچ ئەستۆ ما وەنەوشە، غونچە دڵتەنگ" (مەحوی، ٢٢١)

"د باغێ من مەدام دل تێ، جنەسری و سۆسن و گول تێ
بنەفش و تەرح و سونبول تێ، چەڤین سەر شوبهێ رێحانی" (جزیری، ٥٦٩)
خاڵ

"ڕەیاحین پەرچەم و لالە کولاە و یاسەمەن توڕڕە
بەنەفشە خاڵ و نێرگس چاو و گوڵ-زار و سەمەن ساقە" (نالی، ٣٧٥) خاڵ

"وەکی ئەو تێنە سەر بالان، ببینن نوقطە و خالان
بنەفش و تەرحێ ئالالان، د سەر ماهێ تابانێ" (خانی، ٤٠٩) خاڵ

"غەبغەب و خاڵ و لەب و تورەیی یار
سونبول و سیب و بەنەفشە و گوڵنار" (سالم، ٢٠٠) خاڵ

"سیاپۆشن لە داخی خەت و خاڵ و لێو و ڕوو و زوڵفت
وەنەوشە و میسکی چین و ئاوی خزر و لالە و عەنبەر" (مەحوی، ١٥٨) خەت

"ملی کەچ کرد وەنەوشە، کەوتە بەر پێت وەک قەباحەتبار
کە دەرکەوت خاڵی لێوت تێگەیی شێت و خەتابارە" (موختار، ١١٤)خاڵ

"ئەی شەماڵ، ئەی شیفای نەساغان، وەرە تۆ بێ و خاڵی ڕووی یار
بە گوڵ و وەنەوشەی باغان، بگەیێنە دوعا و سەلام" (وەفایی، ١٣١) خاڵ

"ڕوو و خاڵی ڕەونەقی لالە و وەنەوشەی ساندووە
لالە داو وا وەنەوشەش بۆیی هەر ماتەم دەکا" (سافی، ١٨) خاڵ

بەکارهێنانێکی تری باوی وەنەوشە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، زوڵف و پەرچەمە. لێرەدا بۆنخۆشی و نەرمی گوڵی وەنەوشە هۆکارە بۆ ئەم چواندنە و شاعیران دەڵێن ئەگەر بۆنی زوڵفی یارمان چنگ بکەوێ؛ چ نیازمان بە بۆن و بەرامەی وەنەوشە و گوڵەکانی ترەوە هەیە؟ بەهەمان شێوە، لە هەندێ بەیتدا کاتێک یار جیلوە دەکات و خۆی لە باغ و گولخانەدا دەنوێنێ، لەتاو بۆنی خۆشی پەرچەم و زوڵفی یار، وەنەوشە سەری خۆی

دادەخات و وەک بڵێی: "بۆی زوڵفی یار بۆنێکە نەک منێکی گوڵی وەنەوشە، بەڵکە بە تەواوی گوڵی ناو گوڵزار کۆببینەوە هەوایەک لە بۆنی ئەو نادەین، ئیتر بۆ سەرم کز-کز دانەخەم و گەردەنم کەچ نەکەم؟!" بڕواننە ئەم وێنانە:

"کە تۆ هاتی بە گوڵشەندا لە شەرمی زوڵف و ڕووی تۆ بوون

وەنەوشە و گوڵ سەراسەر غەرقی خوێن، مات و سەر ئەفگەندە" (وەفایی، ٢١٢)

"نێرگزان سەر دگرانن، ل بنەفشان خەم و تابە

چیچەکێن قەسێ قەزەح رەنگ هەزار رەنگ سەمایە" (جزیری، ٥٢٠) بسک

"چنیم، گرتم، گەزیم، بۆم کرد و لام دا

وەنەوشە و سونبول و سێو و گوڵی نار!" (سالم، ١٧٨) زوڵف

"بەنەفشە کەوتە ژێر سونبول لەسەر گوڵ

کە تێکەڵ بوو لە سوبحا زوڵف و پەرچەن" (سالم، ٣١٠) زوڵف

"بۆی وەنەوشە و سونبوڵە سەحرا سەراسەر تۆ دەڵێی

بای سەبا عەنبەر دەبارێنێ لە دەشت و کۆهسار"     (وەفایی، ٧٦) زوڵف

"بەنەفشەی پەرچەمی نیلی کە بەر ڕووی نەستەرەن پەخشە
سەوادی زەڕگەڕی ڕووسە، لەسەر سەحفەی تەڵا نەقشە" (ئەدەب، ١٢١)

"لە داغی سیلسیلەی تورەی نیگاری نازەنینی خۆم
ئەبێ تەرکی وەنەوشە و سونبول و هەم عەتر و عەنبەر کەم"   (موختار، ٨٦)

"نەسرین و بنەفشە تەووزاندن
ماوەرد درەشاندە شوشەیێ عاج"     (جزیری، ١٩٧)  کەزییە

"لە لام بێ قەدرە من بۆنی وەنەوشە و یاسەمەن ئەمرۆ
کە دێتە بەر خەیاڵم پەرچەمی وەک موشکی تاتاری"   (موختار، ١٦٧) پەرچەم

"ئەوەی نەشئەی لە بۆنی زوڵفی تۆ وەرگرتبێ گیانە
ئیتر شەوبۆ و وەنەوشە و سونبول و ڕێحانە بۆ ناکا"   (کەمالی، ٣٣)  زوڵف

بەکارهێنانی وەنەوشە لەبری بۆنی سینە و مەمک:

"با بێنێ بۆنی سنگ و مەمەت، کەی منی هەژار

ئیتر خەیاڵی بۆنی وەنەوشە و گوڵاو ئەکەم" (موختار، ۹۱) سنگ

بەیتێک لە شیعرە بەهارانەکەی حاجی:

"لەکن بەنەوشە و خاو و هەڵاڵ و بەیبوونی

هەڵاڵی پێستەیی خاوە، عەبیر و موشکی خەتا" (حاجی، ۳۹)

# گوڵی نەسرین

**"من گوتم: گرتی حەبەش کەعبەی جەماڵت؟ ئەو دەڵێ:**

**کاروانی میشکە بۆ شارێ گوڵ و نەسرین دەبا"**

**"وەفایی"**

نەسرین ڕووەکێکە لە بنەچەی گوڵەباغ، لە چەم و چخورد و قەراغی باخەکاندا دەڕوێت.[1] گوڵەکانی دوو جۆرن، جۆرێکیان پێی دەڵێن گوڵی موشکین، ئەوی دیکەیان پێی دەڵێن گوڵی نەسرین.[2] ڕەنگی گوڵەکانی؛ سپی و زەردن، لەو جۆرەی گوڵەکەی سپییە؛ لەسەر پەڕی گوڵەکە، پەڵەی سووری تێدایە. گوڵە زەردەکەشی بە نێرگس دەکات و هەندێکیش دەڵێن دەچێتەوە سەر بنەوانی گوڵی نێرگس. گوڵی نەسرین بۆنێکی خۆشی هەیە و لە بۆنکاریدا بەکاردێت...

لە کوردیدا ئەم ناوانەی بۆ بەکاربراوە: "گوڵەبەرامە، گوڵەچیا، نەسرین، گوڵەگوڵاوی."[3]. لە فارسیدا بە "نسرین" و لە عەرەبیشدا بەم ناوانە هاتووە: "ورد السیاح، ورد البری، جلنسرین، ورد الکلاب.". بە ئینگلیزیش:"wild rose, brier, brier, elegantine sweetbrier" ئەم ناوانەی بۆ بەکاربراون.

---

[1]. کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، ل ٤٢٨.

[2]. فرهنگ دهخدا.

[3]. فەرهانگی کاوە.

گوڵی نەسرین، لە ئەدەبیاتی فارسدا بەم مەبەستانە بەکارهاتووە؛ لەبەر سپێتییەکەی وەک ڕەمزێک بۆ سینە بەکارهاتووە، بەهەمان سیفات بۆ ڕووی یاریش بەکارهاتووە و شاعیران چواندوشیانە بە چەناگە و نینۆکی یار.[1] شاعیرانی کلاسیکی ئێمە، لەبەر ڕۆشنایی و تایبەتمەندییەکانی ئەم گوڵە، تەمایان وابووە بە چەند نیازێک بەکاری بهێنن، لەبەر بەرگە سپی و سافەکەی کە وردە خاڵی سووری تێدا بووە و کوڵم و لاجانگی یاریش لەو شێوەی نواندووە؛ هاتوون بە گوڵی نەسرینیان چواندووە و پەسنێکی جوانیان پێ سازاندووە. بەهەمان شێوە نەرمی گوڵەکەش هۆکارێک بووە بۆ شاعیران، تا ئەم وێنەیە درووست بکەن. ئەو نمونانەی گوڵی نەسرین لەگەڵ لاجانگ، بەرگەردن، ڕوومەت، نێوچاوان، بەکاربراوە:

"ب خالێن وەرد و نەسرینان ژ قودرەت خەت کشاندی لێ

ب تەرحا نێرگزا عێلی سەحەرگاهان نەسیم لێ دا" (جزیری، ٦٩) لاجانگ

"بە مەرگی من هەتا ماوم سەرت وا بێنە بیزانم

ڕوخە یا بەرگی نەسرینە؟ لەبە یا شەککەری خامە" (وەفایی، ٢٤٦)ڕوو

"ڕووە یا گوڵ ئەمە، یا بەرگی نەسرین؟

"لب است این یا شکر، یا جان شیرین" (سالم، ٣٦٠) ڕوو

[1]. حمیرا زمردی، نمادها، نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی، ل ٢٠٣(سینه)، ل ٢٠٧(چانه)، ل ٢٥٧(روخ)، ل ٢٤٣(ناخن).

"بە فەتحی دڵ دەڵێی یار زوڵف و سینە و ڕووی وەدەرناوە

لە نەسرین و گوڵ و سونبوڵ بەهار هات لەشکەری هێنا" (وەفایی، ٤٢) ڕوو

"تا بەهاری ڕووی گوڵڕەنگت بڕێژێ ڕەنگی حوسن

سونبول و نەسرین و لالە و ئەرغەوانم بۆ چییە" (بێخود، ١١٠)ڕوو

"م نێرگز دین د نەسرینان، د نیڤ باغێ گولستانێ

د باغێ من مەدام دل تێ، جنەسری و سۆسن و گول تێ" (جزیری، ٥٦٩) ڕوو

"سونبولێن تەر ل گولان پاڵ ب مەستی ددرن

سوسنێن تازە ل نەسرین وەرەقان بوونە هەلەک" (جزیری، ٤٠٤) لاجانگ

"نەسرین و گوڵ و لالە، مەحجووب ئەبن و والە

گەر لا بدەی ئەو بورقوع، دەرخەی تەنی سیمینت" (موختار، ٦٧) ڕوو

"وەها مەحوی تەجەللای گەردن و ڕووخساری تۆم قوربان!

لە خاکم، ڕەنگە تا مەحشەر کە هەر نەسرین و گوڵ دەربێ" (وەفایی، ٣١٦)

"باخچەی فیردەوس و باغی تەلعەتت؛ یەک گوڵشەنن

غەیری وەی، گوڵزاری تۆ؛ پڕ غونچە و نەسرین ترە" (ئەدەب، ١٥٦)نێوچاوان

وەک چۆن سونبول و ڕەیحانە و وەنەوشە، بەخاتری بۆنخۆشیان بووبوونە کەرەستەیەک بە دەستی وەستا شارەزاکانمانەوە؛ گوڵی نەسرینیش بەدەر نییە لە بۆنخۆشی و نیازی بەوەیە بکرێتە خشتێک لە لایەن شاعیرانەوە و کەڵەک و دیواری گوڵزاری ڕووی یاری پێ تەواو بکەن! لەهەمان کاتدا بۆنخۆشییەکەشی بووەتە هۆکارێکی تر بۆ ئەوەی زوڵف و پەرچەم بچوێندرێت بە نەسرین:

"گولچیچەک و نەقشێن غەریب، نەسرین و ڕەیحانێ عەجیب

لێ ڕاست و چەپ بوێن سەلیب جەدوەل کەشێن زونناریێ خەت"(جزیری، ٣٤٩)

"من گوتم: گرتی حەبەش کەعبەی جەماڵت؟ ئەو دەڵێ:

کاروانی میشکە بۆ شارێ گوڵ و نەسرین دەبا" (وەفایی، ١٦) زوڵف

"هەر بە یادی پەرچەم و ڕووی تۆیە بەخوا جار بە جار

ئەچمە ناو باخ و تەماشای لالە و نەسرین ئەکەم" (کەمالی، ٨٢) پەرچەم

"شەکەر لەب، شاهیدی شیرین، بتی چین، لوعبەتی ماچین
سەراپا سۆسەن و نەسرین، چ لەب نووشین دڵئاراپی" (ئەدەب، ٢٠٣) لێو

بەکارهێنانی نەسرین لەگەڵ سینە:

"سینە وەک گوڵشەنی نەسرینە، شکوفتە، ئەمما
باغەبان بۆ تەمەعی خونچە، چ دەستی نەکەنێ" (ئەدەب، ١٩٩) سینە

"ڕاببرە بە دامان و خیابانی یەخەیدا
نەختێ لە گوڵ و سونبول و نەسرین بوەشێنە" (وەفایی، ٢٦٥) سینە

ئەگەرچی وەفایی لەم بەیتەیدا کە دواتر دێت؛ گەردەنی یاری چواندووە بە گوڵی نەسرین، بەڵام باس لە بابەتێکی دیکە دەکات، ئەویش ڕواندنی گوڵی نەسرینە لەسەر گۆڕەکەی! بەهەمان شێوە ئەحمەد موختار جافیش لە بەیتکدا دەڵێت: گەر یارەکەم بێتە سەر قەبرم، گوڵ و نەسرین لەسەر خاکم سەوز دەبێت. ڕەنگە ئەگەر بەتەنیا گوڵ هەبوایە لە بەیتەکاندا، شتێکی وای نەگۆڕیبا کە جێی بەدواداچوون و خۆخەریککردن بێت پێیەوە، بەڵام بۆ دەبێت گوڵی نەسرین لە ئارادابێت؟ ڕەنگبێ دووبارە ئەفسانە و ئوستوورە وەڵامی ئەمەمان بدەنەوە، بەڵام هیچێکی وامان لەو بارەوە لەبەر

دەستدا نییە و ڕەنگیشبێ تەنیا بەکارهێنانێکی لەخۆوە بێت و گومان و خوتخوتەی ئێمە لە خۆڕا بێت...

"وەها مەحوی تەجەللای گەردن و ڕووخساری تۆم قوربان!
لە خاکم، ڕەنگە تا مەحشەر کە هەر نەسرین و گوڵ دەربێ" (وەفایی، ٣١٦)

"گوڵ و نەسرین لە خاکم سەوز ئەبن گەر بێت و ئەو یارە
لە ڕۆژێکی خەزانا بێتە سەر قەبر و مەزاری من" (موختار، ١٠١)

# گوڵی یاسەمەن

**"لەولاوێکە لەولاوە بە ئەملاوە کشاوە**

**یا یاسەمەنی خاوە، بە ڕووی ڕۆژدا ڕژاوە"**

**"نالی"**

یاسەمەن، درەختێکی بچووکە لە تیرەی زەیتوونیەکان کە شێوەگەلێکی جیاوازی هەیە. گوڵەکانی گەورە و بۆنخۆشن، ڕەنگەکانیان سپی و زەرد و سوورن و لە کاری بۆنخۆشیدا سوودیان لێ وەردەگیرێت. " یاسەمەن ڕووەکێکی خۆهەڵواسەر، یان دەوەنێکی شۆڕە، گەڵاکەی سەوزێکی تێر و بچووکە. گوڵەکەی سپییە و بۆنێکی خۆش و زۆر تیژی هەیە."[1]

لە زمانی کوردیدا؛ لەپاڵ یاسەمەندا، ئەم گوڵە چەند ناوێکی تریشی بۆ بەکار براوە: " ئاسمین، بنەیاسەمەن، سەمەن، سەمەنگوڵ، سیمەنسا، یاس، یاسەمەن، یاسەمین..."[2] لە زمانی فارسیدا بەم ناوانە بانگکراوە: (یاس، سمن، یاسمن...) لە عەرەبیدا (یاسمن) و لە ئینگلیزیشدا (jasmine) پێ دەوترێت. هەندێک پێیان وایە کە بنچینەی وشەکە، دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (ئاسم- اسمن)ی فیرعەونییەکان. گوڵبەندی یاسەمین لە سەر و

---

[1]. کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، ل ٤٥٢.

[2]. فەرهەنگی کاوە.

ملی هەندێک لە پاشا فیرعەونییەکان لە پەرستگەی دیری بەحری (الدیر البحری) و هوارەدا بینراوە.[1]

گوڵی یاسەمەنیش، وەک گوڵەکانی دیکە بەدەر نییە لە بەکارهێنانی نێو ئەدەبیات و شیعر، شاعیران لەم گوڵەش مزەی خۆیان گرتووە و لە بۆن و ڕووە جوان و گەشەکەی کەڵکیان وەرگرتووە. شاعیران وێنەی شیعرییان پێ چێ کردووە و بەهۆی تایبەتمەندییەکانی ئەم گوڵەوە؛ هونەری لێکچواندنیان پێ سازکردووە... لە شیعری شاعیرانی فارسدا؛ یاسەمەن ڕەمزێک بووە بۆ: "سنگ، چەناگە، زوڵف، ڕووخسار، ژێرچەنە- غبغب..."[2] بەخاتری سپێتیی گوڵەکەی، بە سنگ و ڕووخسار و ژێرچەنە و پاوپوز چوێندراوە و نەرمی و بۆنخۆشییەکەشی بەرانبەرن لەگەڵ زوڵف و پەرچەم. لەنێو شیعری کلاسیکی کوردیشدا؛ یاسەمەن ڕەمزێک بووە بۆ چەند ئەندامێک، لەوانە: زوڵف، ڕوو، سینە، پاوپوز، باڵای یار... دیارە هەر یەکەشیان هۆکاری خۆی هەیە و بێ هۆ بەکارنەبراون.

بەکارهێنانی وەک ڕەمزێک بۆ ڕووخسار:

"(پریشان کرد چون بر چهره دو زلف عنبرین، گفتی)

بەهارێک سونبولی تاتای بە بارێ یاسەمەن دا" (وەفایی، ٢٢) ڕوو

---

[1]. کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، ل ٤٥٢.
[2]. حمیرا زمردی، نمادها، نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی. (سینه) ٢٠٣، (چانه) ٢٠٧، (زلف) ٢٢٣، (ڕوخ)، ٢٩٩، (گلو) ٢٣٤.

"وەر ژ عەکسا خەمرییان قەوسێقەزەح دەت یاسەمین
دێ گول و ڕەیحان ببارن، تێک و تێک گولزار بت" (جزیری، ١٢٩) ڕوو

"تورکانە گوڵم پەرچەمی کەوتۆتە عوزاری
وەک سونبولی ئاشفتە لەبەر بەرگی سەمەندا" (وەفایی، ٢٩) ڕوو

"بەبێ جیلوەی گوڵی ڕوخساری شێوە یاسەمەن مەحزوون
دڵی نەسرین پەشێواوە و لیباسی نەستەرەن مەحزوون" (حەمدی، ٤٠٥)ڕوو

"حەلقەی گێسوو تا تا لاچوو، لەسەر وینە و عاریز و ڕوو
شەو چوو سەحەر دیم هاتەدەر شەمس و قەمەر سەرو و سەمەن"
(وەفایی، ١٧٠)

وەک زوڵف و پەرچەم:

"لەولاوێکە لەولاوە بە ئەملاوە کشاوە
یا یاسەمەنی خاوە، بە ڕووی ڕۆژدا ڕژاوە" (نالی، ٤٣٨) زوڵف

"قەت بە بۆنی زوڵفی تۆ نابێ گوڵاڵە و یاسەمەن

عەتری تورەی  تۆ نە وەک عوودە، نە میسلی عەنبەرە"   (موختار، ١١٢)
زوڵف

"پەرچەمی تاتای شکاندی قەدری شەوبۆ و یاسەمین
پێکەنینی حەرمەتی گوڵ شەککەر و هەنگوین ئەبا"  (کەمالی، ٤١) پەرچەم

"ئەو زوڵفی سەمەنسا، کە سەراپایە لە باڵات
چەشمی بەدی لا  دوور بێ، چ زیبایە لە باڵات"   (ئەدەب، ٦٨) زوڵف

"من سەیدی چ دامێکی نەبووم کەوتمە دامت
پا بەندی بە زنجیری سەری زوڵفی سەمەنسا"   (ئوشنویی، ٨٥) زوڵف

"لە لام بێ قەدرە من بۆنی وەنەوشە و یەسەمەن ئەمرۆ
کە دێتە بەر خەیاڵم پەرچەمی وەک موشکی تاتاری"  (موختار، ١٦٧) پەرچەم

"ئاشوفتەگیی سەد دڵی شەیدایە بە جارێ
ئەو زوڵفی سەمەن-سایە، کە ئاڵۆزی شەماڵە"   (ئەدەب، ١٦٩) زوڵف

وەک پاوپوز، ساق:

"ڕەیاحین پەرچەم و لالە کولاە و یاسەمەن توڕڕە

بەنەفشە خاڵ و نێرگس چاو و گوڵزار و سەمەن ساقە" (نالی، ٣٧٥) پا، زوڵف

"نەرگس نیگەە و ساق سەمەن و کورتە بەنەفشەن

موو سونبول و ڕوومەت گوڵ و هەم لالە کولاهن" (نالی، ٢٧٩) قاچ

"د پابووسا سەمەنساییێ م نێری بەژن و بالاییێ

"لعلی حبلغ الاسباب، اسباب السماوات" (جزیری، ٥٧٢) پا و پل

وەک باڵای یار:

"دلۆ وەر سەیرێ بالایان د گولزارا سەمەنسایان

"بها تهتز بانات لنا من میس قامات" (جزیری، ٥٧٥) باڵای یار

"گوڵئەندامێ، سەمەنبوویێ، مەلەکڕوویێ، فریشتەخوو

زلیخا بشربی، لەیلی و شی، شیرین سخن گویی" (سالم، ٥٧٩) یار

"تەنهایی سەمەن بەرگی بەنەوشە کە لەبەرکەن

وەک نووری دڵی موئمین و زوڵماتی گوناهن"  (نالی، ٢٨١)بەدەن

"ناگا بە سەرووی قامەتی ئەو شۆخە ئاهی من
ئەو لەنجەیەی سەبا بە قەدی یاسەمین ئەکا"  (بێخود، ٢٢)

"کافرم گەر بەحسی بتخانە و جگەر لات بێنمە ناو
بۆ منی شەیدا هەمیشە ئەی سەمەنبۆ! تۆی سەنەم"  (سالم، ٣٢١)
وەک سینە و سک:
"یەکسەر هەموو عالەم گوڵی جەنەت شکەنی دا
باغی سەمەن و یاسەمەن سێو و هەناری"  (وەفایی، ٣٦٦) سینە

"وەڵڵاهی کە بیدەم بەهەموو لەززەتی جەننەت
یەکدەم لە سەمەنزاری گوڵ و یاسەمەنت بم"  (ئەدەب، ١١٥)سینگ

"قەتارەی دوگمەکەی سینەی ترازا، بۆ تەماشای من
دوو ناری نەورەسی سەحنی سەمەن-زەرت موبارەک بێ"  (ئەدەب، ١٩١)
"چ بڵێم ناف و شکەم، چۆن و چ تەرزن بە سیفەت

نافی وەک نافە، شکەم؛ خەرمەنی بەرگی سەمەنێ"   (ئەدەب، ۱۹۹)

وەک خەت:

"گوڵ-بەدەن، سیمین-زەقەن، خەت-یاسەمەن، فندق- دەهەن

ئەسمەرەی قەدعەرعەرەی ناز و نەزاکەتدارەکەم"   (کوردی، ۱۰۱)

# گوڵی سۆسەن

**"هەتا غونچە دڵ و سۆسەن زوبانی باغ و بوستانە**

**لەگەڵ مەحزی خەیاڵی، دڵ بە جاریٚ بۆتە کێوی توور"**

**"مەحوی"**

سۆسەن، گیایەکی دوو سێ گەڵاییە لە تیرەی "سوێسنییەکان - Liliaceés" کە سەر بە گیاگەلی "یەک لەتکەییە جام و کاسە رەنگینەکانە: " Monocotylédones a calice pétaloide". گوڵێکی قووچی وەک زەنگۆڵەی لە سەری دێتە دەر کە بە زۆر رەنگی وەک زەرد، نارنجی، سوور، شین و چەرمووی هەیە کە بە خاڵی وردی ئەرخەوانیی ڕازاونەتەوە. تەمەنی کەمە و بەهاران لەژێر نەواڵە بەفران دەڕویٚ و دێتە دەر. بەرزییەکەشی لە چەند سانتیمەترێک، تا یەک مەترە و لاسکەکەی بە کوڵک داپۆشراوە[1]. "سۆسەن گیایەکە لە تیرەی زەنبەق، گەڵای باریک و درێژە و گوڵەکانی جوان و بۆنخۆشن و ڕەنگەکانی سپی و شین و زەردی هەیە. سپییەکەی سووسەنی ئازادی پیٚ دەڵێن."[2]

سۆسەن لە زمانی کوردیدا بە چەند ناوێک هاتووە: "پەلێزە، سۆسن، سۆسەن، سۆسەنی، سووسەن، سوێسن، سوێسنە، سێسنە، گوڵسۆ،

---

[1]. حەمید درەوودی، گوڵنامەی کوردی. (پەڕاوی ئینتەرنێتی)

[2]. مارف خەزنەدار، فەرهەنگی دیوانی نالی، ل ١٠١.

گوڵسۆس"[1] لە زمانی فارسیشدا (سوسن) و لە عەرەبیشدا (زنبق)ی پێ دەڵێن. لە پەهلەویشدا(sūsan) هاتووە. لە ئینگلیزیشدا (lily)ی پێ دەڵێن. لە هێماگەریدا سۆسەنی سپی، ئاماژە بووە بۆ ئازادی و بە (دە زمان)یش ناسراوە، هەروەها پەیوەندییەکی تری سۆسەن هەیە لەبابەت ئوستورەکانەوە و لەگەڵ 'ناهید' و 'خواوەندی ئاو' کە لەگەڵ ئەماندا هەژمار کراوە. لەگەڵ ئەوەشدا، سۆسەن بە واتای زمانپاراوی و زمانزانی هاتووە و لەگەڵ شاری (شوش)دا پەیوەندیەکی زمانی و مێژوویی هەیە! شاری (شوش) کە شارێکی کۆن بووە لە نزیک ڕووباری 'شاوور'ی خوزستان. ئەم شارە پایتەختی زۆر ئیمپڕاتۆر و حوکم بووە، لەوانە (عیلامییەکان، بابلییەکان، هەخامەنشینییەکا، ساسانییەکان، دەوڵەتە ئیسلامییەکان...)[2] و چەندانی تریش. شارێک بووە کە پڕی زمانی جۆراوجۆرو و بنیادەمی جیاواز بووە. ئەم تێکەڵاوییەی خەڵکی لە ڕووی زمان و شارستانییەتییەوە، تایبەتمەندییەکی بە خەڵکی شارەکە بەخشیوە و هەر تاکێکی هۆشیار بووە بەرانبەر چەند زمانێک و بە چەند جۆرێک قسەی کردوە... لێرەوە و لەگەڵ ڕوونبوونەوەی چەمکی(دە-زبان)دا؛ کۆدێکی ترمان لە ئەدەبیاتی کلاسیکدا بۆ دەکرێتەوە کە بە گەرد و تۆزی ئوستوورە و هێماگەری داپۆشراوە. دەستەواژەی (دە زبان) کە لە فارسیدا لەگەڵ گوڵی سۆسەندا هاتووە؛ "بەواتای زمانپراوی و کەسێک دێت کە بە دە زمان قسە بکات، یان هەر جارێک کە دەدوێت، بە جۆرێکی جیاواز

---

1. فەرهەنگی کاوە.
2. لغت نامە دهخدا.

بدوێت."[1] شاری (شوش)یش بە حوکمی تێکەڵبوونی ئەو هەموو خەڵکە جیاوازە و زانینی چەند جۆرە زمانێک لەلایەن خەڵکی شارەکەوە، وای کردووە بە واتای (دە زمانی) و زۆرزانی بێت. لە لەوحە سۆمەرییەکانیشدا ئاماژە بۆ داستانی سەرزیمینی زمانە جۆراوجۆرەکان کراوە کە مەبەست لە بابل بووە.[2] ئەم چەمکانە پێکەوە دەچەنەوە سەر ئوستوورەکان و بنەڕەتێکی هاوبەشیان هەیە. لەم پێشینەیەوە دەتوانین درک بەوە بکەین کە بۆچی شاعیران زمانی شیعریی خۆیان بە سۆسەن چواندووە...

سۆسەن هێمای پاکێتی و سپێتی بووە، پەیوەندی ئەم هێمایە بە ئوستوورەکانەوە زیاتر هەڵدەگرێت و هێنانەبەرباسی ئەو بابەتانەش، کاتێکی زۆرتر و شوێنێکی فراوانتری پێویستە، چون نامانەوێ بەستێنی بابەتەکە فراوانتر بکەین و ئەفسانە و ئوستووورە دەستبگرن بەسەر فەزای نووسینەکەدا.

با بێینەوە سەر بەکارهێنانی سۆسەن لە شیعری کلاسیکدا و بزانین داخۆ چۆن بەکاربراوە و شاعیران ئەمجار چ شتێکیان پێ چواندووە! لە شیعری شاعیرانی فارسدا، سۆسەن ڕەمز بووە بۆ "لاجانگ و دەست و زمان"[3] لە کتێبی (گل و گیاه)لە ئەدەبیاتی فارسیشدا هاتووە کە " سۆسەن کینایەیە

---

[1]. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2]. بڕوانە: محمد جعفر یاحقی، فرهنگ اساطیر و داستان واره ها در ادبیات فارسی، ل ٤٨٧- ٤٩٠.

[3]. حمیرا زمردی، نمادها، نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی. (لاجانگ) ٢٠٢، (دەست) ٢١٢، (زمان) ٢١٩.

لە زمان و بە واتای کەسێکیش دێت کە زمانپاراوە..."[1] لە شیعری ساعیرانی کلاسیکی کوردیشدا بۆ چەند نیازێک بەکاربراوە. وەک پێشتر کە لە ئوستوورەکەوە بۆمان دەرکەوت، سۆسەن بەواتای زمانپاراوی و زمانزانی هاتووە و شاعیرانیش ئەم ڕەمزەیان لە شیعرەکانیاندا بەکار هێناوە:

"نالی زوبانەکەی تەڕ و پاراوی سەوسەنت

حەیرانی چاوی نێرگسە وەک لاڵە، نادویێ" (نالی، ٥٨٢)

"زوبانی لاڵە، بۆ حەیرانە، حاڵی بۆ پەرێشانە

لە سۆسەن دەفکرم "مەحوی"، لە وەزعی نێرگس و سونبوول" (مەحوی، ٢٢٧)

"هەتا غونچە دڵ و سۆسەن زوبانی باغ و بوستانە

لەگەڵ مەحزی خەیاڵی، دڵ بە جارێ بۆتە کێوی توور" (مەحوی، ٤٤٩)

ئەگەرچی لە شیعری شاعیرانی فارسدا سۆسەن نماد و ڕەمز نەبووە بۆ زوڵف و کەزیەی یار، وەلێ ئەم چواندنە لای شاعیرانێکی وەک جزیری و

---

[1]. غلامحسین رنگچی، گل و گیاه در ادبیات منظوم فارسی. ل ٢٢٨.

ئەدەب دەبیندرێت و مامۆستا هەژاریش لە شەرحی دیوانی جزیریدا هەر بە کەزیە و زوڵف لێکی داوەتەوە...

"د باغێ من مەدام دل تێ، جنەسری و سۆسن و گول تێ

بنەفش و تەرح و سونبول تێ، چەڤین سەر شوبهێ رێحانی" (جزیری، ٥٦٩)

"قامەتی نارەوەنی گوڵشەنە، ئەما بە قیاس

سونبول و سۆسەن و گوڵ بەرگ و بەری نارەوەنێ" (ئەدەب، ١٩٩)

"دانەیێن عەنبەر ل نەسرینان رەشاندن خالێ خام

سوسنێن نازک ل سەر خالان چەڤاندن دالێ دام" (جزیری، ٤٣٧)

# گوڵنار

**"بە تەحریراتی عاشقدا وەرەق ڕەسمێکی مەترووکە**

**دەکا ئەفشانی مەتلووبم سەراپا ئەشکی گوڵنارم"**

**"سالم"**

گوڵنار، شکۆفە و گوڵی هەنارە کە لە سووریدا ڕەنگێکی بێ هاوتای هەیە، هەندێک دەڵێن کە ئەم درەختە تەنیا ئەم گوڵەی هەیە و سوودێکی دیکەی نییە..[1] "گوڵنار جۆرێکە لە گوڵی هەنار، بەڵام ئەم خرِی هەڵنادا و تێکەڵی دەرمانی دەم و هێندێ دەرمانی تر دەکرێ و پێی دەڵێن 'گوڵناری فارسی.[2] وەک دەردەکەوێت ئەم دارە بەری نییە و تەنیا گوڵ دەگرێت، گوڵەکەشی ڕەنگێکی سووری ئاڵی هەیە و دڵبزوێنە لە جوانیدا. لە زمانی کوردیدا ئەم ناوانەشی پێ دەڵێن:" شەرمینۆک، گوڵنار، گوڵەنار، گوڵەهەناری وەحشی" بۆ ئەم مەبەستانەش هاتووە؛ هەر گوڵەباخێکی پڕپەڕ و گەورە، هەرشتێکی لە ڕەنگی گوڵەهەنار، شەرابی سوور..."[3] بە فارسی (گلنار، گل انار، نارخو) ڕۆیشتووە و لە عەرەبیشدا (جُلَّنار)ی پێ دەڵێن، لە زمانی ئینگلیزیشدا (Pomegranate).

---

[1]. لغتنامه دهخدا.

[2]. فەرهەنگی خاڵ.

[3]. فەرهەنگی کاوە.

له شیعری شاعیرانی فارسدا، گوڵنار لەبەرانبەر ڕووخساردا بەکاربراوه و هێمایەک بووه بۆی.[1] له شیعری شاعیرانی ئێمەشدا؛ گوڵنار ڕەمز بووه بۆ چەند شتێک. بەخاتری سووری و ئاڵییەکەی؛ شاعیران لێوی دڵبەری خۆیان پێ چواندووه، ڕوومەتیش لەبەر ڕووسووری، به هەمان نیاز گوڵناریان بۆ بەکارهێناوه.

لێو:

"لافی چی لێدەن له هەمڕەنگی لەب و پستانی تۆ
وا نه نارم دی لا بوستانا، نه وا گوڵناری تۆ" (سالم، ٢٧٤)

"من جان یەدێ بەیزایه ژ ئیسان چ خەبەر دەم
من ئاتەشێ موسا دییه گولنارێ شەرابێ" (جزیری، ٥٥٥)

"به دوو لەب؛ جووتێ گوڵنارن، به غەبغەب؛ سێوی خانسارن
به گیسوو؛ دوو سیەه مان، به چاو؛ ئەفسوونی مارانن" (ئەدەب، ١٣٢)

"که فەسساد قەسدی فەسدی لێوی تۆی کرد
جیهان گرتی سەراسەر ڕونگی گوڵنار" (سالم، ١٩٣)

[1]. حمیرا زمردی، نمادها، نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی، ل ٢٢٧.

ڕوومەت:

"زوڵف ئەگەر دووکەڵە، دووکەڵ بەری گوڵناری نییە

سەروە گەر قامەتی کەی سەروی ڕەوان بارەوەرە" (نالی، ٣٣٩)

"تو خەدا دڵم مەشکێنە، با بزانم ڕووت وا بێنە

ڕووتە یان گوڵ هەنارە؟ لێوتە یان شەکری خاوە" (وەفایی، ٢٧٤)

"زولفت سەنەما! لەو گوڵی ڕووخسارە نموودار

یە نافەیی چین چینە! لەسەر خەرمەنی گوڵنار!" (ئەدەب، ٨٩)

"گوڵناری ڕوخت ڕەشکی بە گوڵزاری ئیرام دا

دووتاقی برۆت تەعنی لە میحرابی حەرەم دا" (سافی، ٢٤)

شاعیران گوڵنارییان بەکارهێناوە لەبری ئەشک و فرمێسک، چوون لە حەژمەتیدا، هێندە دەگریەن، شاعیران ئاویان لە چاو دەبڕێ و چیدی خوێن دێت کە بە ئەشکی گوڵنار ناوی دەبەن:

"بە تەحریراتی عاشقدا وەرەق ڕەسمێکی مەترووکە

دەکا ئەفشانی مەتلووبم سەراپا ئەشکی گەڵنارم" (سالم، ٢٨٧)

"تەماشای ئەشکی گوڵنارم لە سایەی چاوی خوێناوم

هەموو کەس مەستی بادەی کەیف و شەوقی بەزمی جانانە"   (حەریق۰ ١٤٠)
ئەشک

"گەر بە قانوونی وەفاداری دەپرسی حاڵی زار

ڕەنگی زەرد و ئاهی سەرد و ئەشکی گوڵنارە ئەدەب"   (ئەدەب، ٦٤)

لەم بەیتەدا وەک گۆی مەمک بەکاربراوە:

"دوو هەناری نەورەسن، هەریەک بە یەک گوڵنارەوە

یا دوو نارنجی ڕەسیدەن لەو بەهاری پارەوە"   (ئەدەب، ١٧٧) گۆی مەمک

وەفایی شاعیر، لە بەیتێکدا بە مەبەستێکی عیرفانی بەکاری هێناوە و وا لێکدراوەتەوە کە بە واتای گەیشتنە ئاکام و مەنزڵ بێت!:

"لە سایەی ڕۆژی هیممەتی، "وەفایی" بوو بە جەننەتی

نەخلی سنەوبەر سوورەتی، بار-بار بەری گوڵناری گرت"   (وەفایی، ٥٦)

# گوڵی نەستەرەن

**"بەنەفشەی پەرچەمی نیلی کە بەر ڕووی نەستەرەن پەخشە**

**سەوادی زەڕگەڕی ڕووسە، لەسەر سەحفەی تەڵا نەقشە"**

**"ئەدەب"**

نەستەرەن، یەکێکە لە جۆرە کێوییەکانی گوڵی سور کە گوڵەکەی بۆنێکی هێجگار خۆشی هەیە، ڕەنگی گوڵەکانیشی سپی و سووری کاڵ دەنوێنن. نەستەرەن لەناو کورداندا، ئەم ناوانەشی بۆ بەکار هاتووە: "بەرەکونار، شیلان، جلێق، ژووژەسوورە، شیلان، شیلانەدەشتی، گوڵباخ کێوی، گوڵبۆ، گوڵەچیا، گوڵەسەگانە، گوڵەشیلانە..."[1] " نەستەرەن گوڵێکی بۆنخۆشە، ڕەنگی سپی و سووری هەیە، گوڵەکەی بچووکترە لە گوڵی سوور کە لە هەر لخێکییەوە چەندان گوڵ شکۆفە دەکەن."[2] لە زمانی فارسیدا بە (نستر، نستروین، نسترون) هاتووە و لە پەهلەویشدا بە (nastarōn) نووسراوە. بە ئەنگلیزی (dog rose)ی پێ دەڵێن و لە عەرەبیشدا (النسترن).

لە شیعری شاعیرانی فارسدا لەبەر بۆنخۆشییەکەی؛ زوڵفی یاریان پێ چواندووە و سپێتی و سورریی بەرگەکەشی، دووبارە بووەتە هۆی ئەوەی بیچوێنن بە ڕووی دڵبەر.[3] لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیشدا، ئەم

---

[1]. فەرهەنگی کاوە.

[2]. فرهنگ نام ها.

[3]. غلامحسین رنگچی، گل و گیاه در ادبیات منظوم فارسی، ل ٤١٦.

بەکارهێنانانە دەبیندرێت، دەبینین نەستەرەن ڕەمزێکە بۆ زوڵف و ڕووی یار:

"جیلوەی سەبا، لەنجەی شەماڵ، بۆی زوڵف و خاڵی یار دەدەن
یا نەوبەهار دێنێ بە بار، میشکی تەتار، بۆی نەستەرەن" (وەفایی، ١٦٦)

"چیچەک و گول سەحەرگاهان، نەستەرەنێن د خەر گەهان
تێکی ژ میسک و ماوەردێ، ماهێ خوناف و ژالە کر" (جزیری، ٢٧٠)

ڕوو:

"کوتی: ڕووم وا دەکەم تێرم ببینی، چاوەڕێم داخۆ؛
لەلای قیبلەم کە کەی بای وەعدە بێنێ نەستەرەن بێنی" (وەفایی، ٣٣٦)

"بەنەفشەی پەرچەمی نیلی کە بەر ڕووی نەستەرەن پەخشە
سەوادی زەڕگەڕی ڕووسە، لەسەر سەحفەی تەڵا نەقشە" (ئەدەب، ١٢١)

"بە جەستە بەرگی نەستەرەن، تورڕە وەک پەڕی زەغەن
پەڕی زەغەن، بە سەد شکەن، تەرازی بەرگی نەستەرەن" (ئەدەب، ١٨١)

لەبەر ئەوەی بەرگی گوڵەکەی سپی بووە؛ قابیلییەتی ئەوەی هەبووە شاعیران ئەندامانی لەشی یاری پێ بچوێنن، بۆ نموونە ئەدەب لە شیعرێکدا دوو جار ئەم وێنەیە دووبارە دەکاتەوە و ڕانی چواندووە بە گوڵی نەستەرەن و چەفتەشی وەک بەرگی لالە لەسەر پەخش کردووە:

"چ بڵێم! چەفتەیی ڕەنگینی لە نێو ڕانی سپی

وەک پەڕی لالەیی حەمڕایە، لەسەر نەستەرەنێ" (ئەدەب، ١٩٨)

# گوڵی ڕەعنا

**"باغەبان بۆ خۆی کە هات ئارائشی گوڵزاری دا**

**خاری میسکین تۆ بڵێی چ بکا گوڵی ڕەعنا نەبوو؟!"**

**"وەفایی"**

ڕەعنا، گیایەکی گوڵدار و جوانە کە لە وەرزی بەهار و هاویندا گوڵ دەردەکات و هەرچەندێک بەرەو پاییز بڕۆین گوڵەکانی کەم دەکات و هەڵدەوەرێن. گوڵی ڕەعنا دوو ڕەنگە، لە ناوەوە سوورە و لە دەرەوە زەردە. لەبەر ئەمەشە بە گوڵی دووڕوو ناسراوە. ڕەعنا، "گوڵی دووڕەنگ، ئەو گوڵەیە کە لە ناوەوە سوور و لەدەرەوە زەردە، گوڵی قەحپەشی پێ دەڵێن"[1]

ڕەعنا کە لە عەرەبیدا (رعناء) و لە فارسیشدا (گل دورنگ، گل دوروی، گل قحبه)[2]ی پێ دەڵێن، بەدەر لەوەی بۆ ناوی گوڵێک بەکاردێت، بە زۆر واتای تریش هاتووە، بۆ نموونە جوانی و دڵڕفێنی، سەروەت، قامەت و باڵا، خۆبەگەورەزانین، فیز...[3] لە فەرهەنگە فارسی و عەرەبییەکاندا بە ژنێکی گەلحۆ و دەبەنگ وتراوە، بەدەر لەوەش بە ژنێک وتراوە کە فیزی هەبێت و خۆپەسەند بێت[4] لە زمانی کوردیشدا چەند بەکارهێنانێک

---

1. لغتنامه دهخدا.
2. غلا محسین رنگچی، گل و گیاه در ادبیات منظوم فارسی، تهران، چاپ اول، ١٣٧٢، ل ٣٣٦.
3. فرهنگ نام ها.
4. فرهنگ فارسی عمید.

هەبووە  بۆ ئەم واژەیە، بۆ نموونە؛ ژنی کەودەن، خۆپۆسەندی و خۆ بە گەورەزانین، جوانی و ڕێکی و شەنگی. لە فەرهەنگی کاوەشدا بەکاربردنی زیاتر دەبینین" جوان، جوانولەبار، چەرمڵەونەرمڵە، خشکۆک، ڕەعنا، ، ڕێک، ، شەنگ،  ژنی گێل و حۆل و سست، ژنی نەزان و خۆڕازێنەوە،  بادسار: بەتەکەببوور، بەحینوان، بەدەحیە، بەدەعیە، بەدەمار، بەفیز، بەهەوا، ترتۆپ، ترزل، خۆبەزلزان، خۆپەرست، خۆپەسند..."[1] ئەم واتایانەی 'ڕەعنا' لە ئەدەبیاتیشدا ڕەنگی داوەتەوە و شاعیرانی فارس، هەر تایبەتمەندییەکی ئەم واژەیەیان وەرگرتووە و لە شیعرەکانیاندا بەکاریان وێناوە. بۆ نموونە لە بارەی ژنی بەد و خراپدا، ناسری خوسرەو چەمکی ڕەعنای بەکارهێناوە و ژنی خراپی پێ چواندووە. ڕەنگیش بێت لەوێدا مەبەست لە ژن؛ دنیا بێت، چون دنیا لە شیعری شاعیراندا بە ژن، یان پیرەژن چویندراوە. ئەمەش بابەتێکی ترە و لێرەدا زیاتری لەسەر نادوێین.[2]

"گر طلاق بدهی این زن رعنا را   /   دان که چون مردان کاری بکنی کاری" (ناصرخسرو)

یان حافزی شیرازی لەم بارەیەوە دەڵێت:

"جهان پیر رعنا را ترحم در جبلت نیست

ز مهر او چه می پرسی در او همت چه می بندی"   (حافظ)

---

1. فەرهەنگی کاوە.

2. بۆ زیاتر خوێندنەوە لەسەر دنیای دوون و پیرێژن، بڕوانە کتێبی: شیعری کلاسیکی کوردی و تابووشکێنی، لە نووسینی: بوشڕا کەسنەزانی، ل ١١٤.

لە بابەتی لەشڕێکی و قەد و قامەت جوانییەوە، شاعیرانی فارس، دووبارە سودیان لە ڕاعنا وەرگرتووە، مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

"در نظر آنچ آوری گردید نیک / بس کش و رعناست این مرکب و لیک" (مولوی)

شاعیرانی فارس، لەبابەت بەکارهێنانی چەمکی ڕەعناوە وەک 'گوڵ دانەماون و سەعدی شیرازی لەم بارەوە دەڵێت:

"سعدیا غنچہء سیراب نگنجد در پوست

وقت خوش دید و نخندید و گل رعنا شد" (سعدی)

شاعیرانی کلاسیکی کوردیش گوڵی ڕەعنایان لەنێو شیعری خۆیان ئاخنیوە و وەک شاعیرامی فارس. کەڵکییان لە تایبەتمەندییەکانی ئەم گوڵە وەرگرتووە.[1] لەو بابەیدا کە وتمان ڕەعنا بە واتای گەورەیی و خۆبازلزانی دێت؛ شاعیران نموونەی شیعرییان هەیە و دەڵێن:

"باغەبان بۆ خۆی کە هات ئارائشی گوڵزاری دا

خاری میسکین تۆ بڵێی چ بکا گوڵی ڕەعنا نەبوو؟!" (وەفایی، ١٨٣)

---

[1]. نیازمان بەوە نەبوو نموونەی شیعری شاعیرانی فارس بهێنینەوە، پێشتریش لەسەر چەند کتێبێکی تایبەت بەو بوارە کە لێکۆڵینەوە بوون و حازربەدەست بوون؛ نموونەمان بۆ گوڵەکانی پێشتر هێنابوویەوە، بەڵام بۆ گوڵی ڕەعنا سەرچاوەیەکی وا لەبەردەست نەبوو، بۆیە بەپێویستمان زانی لێرەدا خۆمان چەند بەیتێک لە شیعری شاعیرانی فارس بهێنینەوە...

لێرەدا شاعیر یاری بە گوڵی ڕەعنا چواندووە و پەسنی دەکات بە گەورەیی و جوانی، لە کاتێکدا لەبەر پێیدا کەوتووە و سەجدەی بۆ بردووە، کە ئیتر ئەمە ئەوپەڕی نیشاندانی گەورەییە:

"لە ناو باخا وەختێ کە سەرو ئەبینم بۆی ئەبەم سوجدە
بە بەرزی و سەرکەشی چونکە شەبیهی قەددی ڕەعناتە" (کەمالی، ١٠٧)

" کەوتم لە بەری پێی و وتم: ئەی گوڵی رەعنا
ئەیٚ ڕۆحی ڕەوانم چ بە سوورەت چ بە مانا" (وەفایی، ٩٧)

"وەرە ساتێ بە ڕەعنایی، ببینە حاڵی شەیدایی
بڵێ چۆنە بە تەنهایی، ئەدەب بێ من، شەکیبایی" (ئەدەب، ٢٠٣)

"نەمدیوە وەکوو تۆ کەسێ وا دڵبەر و ڕەعنا
ڕوومەت گوڵ و موو سونبل و چاو نەرگسی شەهلا" (ئوشنوویی، ٨٥)

بەکارهێنانی ڕەعنا وەک قەد و باڵا و خودپەسەندی و بێ شەرت و پەیمانی:

"تا بڵێی خۆش مەنزەر و میشکین خەت و ڕەعناقەدە
تا بڵێی بەد عەهد و شەرت و بێ وەفا و خودسەرە" (ئەدەب، ١٦١)

"به ئاهم گەر ڕەقیبانت بسووتێن ئەی گوڵی ڕەعنا
مەڕەنجە، تو خودا شوعله له ئاقاری چقڵ چبکا؟!" (مەحوی، ٤٨)

"دڵئاراما چ زیبایی، دڵئاراما چ ڕەعنایی
چ دڵکەش چیهر و سیمایی، چ سەرکەش قەدد و باڵایی" (ئەدەب، ٢٠٣)

"سوبحانه! چ زیبەندەیه ئەو قامەتی ڕەعنا
یەک عیشوە و دوو لەنجه و سێ ناز و تەدەللول (ئەدەب، ١١٣)

# گوڵی شەوبۆ

**"شەو بۆیی سەری زوڵفت لە سەری دام**

**ئیستەش سەرەکەم مەستە، لەبەر نەشئەیی شەوبۆ"**

**"نالی"**

شەوبۆ، گیایەکە سەرەتای بەهار شین دەبێت و گوڵی سپی، پەمەیی، بنەوشەیی، زەرد، سوور، شین دەگرێت و بۆنخۆشن. بە ڕۆژ بۆنی نییە و لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا دەگەشێتەوە و بۆن پەیدا دەکات و تا بەرەبەیان بۆن دەدات.[1] لە فەرهەنگی خاڵدا هاتووە کە "گیایەکە گەڵاکەی وەک بی وایە، گوڵێکی زۆر بۆنخۆش دەگرێ و بە شەو بۆن دەداتەوە."[2] شەوبۆ گوڵێکی بۆنخۆشە، ڕەنگی زەردی کاڵ و سووری تێری هەیە، قەدی گیاکەی تا نیو مەتر بەرز دەبێ، لە بەهاراندا گوڵ دەکات، بە شەو بۆنی لە ڕۆژ زیاترە، لەبەر ئەوەشە شەوبۆی پێ دەڵێن.[3] لە (فرهنگ نظام )یشدا هاتووە کە شەوبۆ "گوڵێکە لە شەودا بۆن دەدات و لە ڕۆژدا بۆنی نییە.[4]"

فارس پێی دەڵێت (شب بو)، لە زمانی عەرەبیشدا بە (منثور) هاتووە و لە ئینگلیزیشدا بە (Stocks). گوڵی شەوبۆ، بەدەر لە ناوی 'شەوبۆ'، لە زمانی

---

[1]. فەرهەنگی ئاناهیتا.

[2]، فەرهەنگی خاڵ.

[3]. مارف خەزنەدار، فەرهەنگی دیوانی نالی.

[4]. فرهنگ نظام.

کوردیدا وشەی تریشی بۆ بەکار هاتووە، وەک: " شەڤبەنک، شەوبۆسان، شهەبوو، گیابەن..."[1] دیاریشە کە ناوەکەی بە خۆوەیەتی و چون بە شەودا بۆنی داوە، بۆیەش ناونراوە شەوبۆ.

بۆنە خۆشەکەی، وای کردووە شاعیرانی کورد، لەپاڵ وشەی زوڵف و گێسوو ڕیزبەند بکەن و بڵێن: بۆنی سەری زوڵفی دڵبەرەکەم زۆر لە شەوبۆ خۆشترە!! لە کاتێکدا ئەمە زیادەڕۆییەکی زۆرە کە شاعیر دەیکات. هەڵبەتە 'شەو' لە بەیتەکاندا هەن و پاتەی ئەوە دەکەنەوە کە شەوبۆ بە شەودا بۆن دەدات.

"شەو بۆیی سەری زوڵفت لە سەری دام

ئیستەش سەرەکەم مەستە، لەبەر نەشئەیی شەوبۆ" (نالی، ٣١٧)

"تا دەماغم کەیلی عەتری زلفی بوو؛ شەو بۆم ئەکرد

وامدەزانی پووشی وشکە بۆی گوڵی شەوبۆم ئەکرد" (حەمدی، ٢٩٢)

"تاتا کە بە داو زولفی وەکوو سونبولی بادا

گوڵدەستەیی شەوبۆ بوو بە بەرگی گوڵیدا دا" (وەفایی، ٣٧٦)

---

[1]. فەرهەنگی کاوە.

"گا دەستەیێ ڕەیحان و گەهی بەستەیێ شەوبۆ
گا عەنبەری لەرزان و دەمێ نافەیی تاتار" (ئەدەب، ٨٩)

"لە شەرمی خاڵی ژێر پەرچەم، وەنەوشە گەردنی کەچ بوو
وەکو موجریم خزایە سێبەری بن باڵی شەوبۆوە" (حەمدی، ٢١٠)

"ئەو کەسەی تای پەرچەمی تۆی گیانە شەو بۆ کردووە؛
نەفرەتی دائیم لە بۆنی خۆشی شەوبۆ کردووە!" (کەمالی، ١١١)

"بە عاریز؛ مەعجەری پشکۆ، بە گیسوو؛ گوڵشەنی شەوبۆ
ئەگەر حەقت دەوێ ئەمڕۆ، لە دنیا تاق و تەنهایی" (ئەدەب، ٢٠٣)

"با ئەگەر بۆم بێنێ بۆنی میسکی پەرچەمت
چۆن ئیتر من بۆنی عەتر و سونبول و شەوبۆ ئەکەم" (کەمالی، ٩٠)

# گوڵی نەیلۆفەر

**چەشمەیی نەهری ڕەوان دیدەیی گریانی منە**
**موژە تا مەددی بەسەر، نیلووفەرستانی منە"**
**"سالم"**

لیلوفەڕ، نیلووفەڕ، نەیلووفەڕ، لاولاو... گوڵێکە لە ئاودا دەڕوێت، لەگەڵ خۆرهەڵاتندا سەر دەردێنێت و لەگەڵ ئاوابوونیشیدا دەچێتەوە نێو ئاوەکە. "گوڵێکە لەناو ئاودا دەڕوێ و بەرز دەبێتەوە تا سەر ئاوەکە دەکەوێت، ئینجا گوڵێکی سپی دەکات وەک دەرخۆنە[1]." لە ئینگلیزیدا (lotus)ی پێ دەڵێن و لە فارسیشدا (نیلفر، نیلپر، نیلوفر...) نیلۆفەر لە وشەی میسرِی نانوفەر(nanoufar)ەوە هاتووە کە واتای جوانی دەدات. نیلۆفەر دەمادەمی سبەینان دەم دەکاتەوە و ئێوارانیش بە دیارنەمانی خۆر دەچێتەوە ناو یەک. بە لای میسرییە کۆنەکانەوە؛ جوانترین گوڵی دنیا بووە و هێمای لەدەیکبوونەوەی دنیا بووە لە ئاوەوە... لە لای گەلانی مایا؛ نیشانەی دەوڵەمەندی و بەپیتی بووە. لە کتێبی پیرۆزی هیندییەکاندا هاتووە کە نیلۆفەر ڕەمزی کامڵبوون و شکۆفەکردنی ڕۆحە لە زوڵمەت و تاریکیدا [2]. لە بیروباوەڕی هیندییە کۆنەکاندا؛ نیلۆفەر نیشانەی گەورەیی ئافرێنەر و خودا و خوداوەندانە، بۆ نمونە لە دەستی چوارەمی خوداوەند

---

[1]. فەرهەنگی خاڵ.
[2]. ژان شولیە – الن گربران، فرهنگ نمادها، جلد: ٥، ص: ٥٠٢.

(ویشنو)دا، گوڵی نیلۆفەر دەبینیت، هەروەها دەڵین (براهما) لەسەر شێوەی گوڵی نەیلۆفەر لە ناوکی (ویشنو)دا ڕوا. لە ئێرانی باستاندا نیلۆفەر بە واتای ناهید-خوداوەندی جوانی-، یا ئەفرۆدێیت هاتووە[1]... لە ئوستوورە یۆنانییەکاندا؛ نەیلۆفەر بە دوو ناو هاتووە، ڕەنگی نیلی(Nile) و نیلوس(Nilos). نیلۆس خوداوەندی ڕووباری نیل و کوڕی ئۆقیانووس بووە. نیل پاشا و فەرمانڕەوای میسڕ بووە. ناوی نیلی ئێستا لەمەوە بۆ گەلی میسڕ ماوەتەوە. لە زمانی یۆنانیدا، نیلۆفەر بە (نیمفا) هاتووە، وا پێدەچێت لە ناوی (نمف)ها (nymphes)وە هاتبێت، کە بە مانای ژنی جوانی هاوشێوەی پەری دێت...[2] لە بیروباوەڕی پیرۆزی گەلە ئێرانی و هیندییەکاندا، نیلۆفەر ڕەمزی ڕۆشنبینیی دڵ و دووبارە لەدایکبوونەوەیە بە نوری زاتی خودا. لەم بارەوە زیاتر ناچینە قووڵایی بابەتەکە و ڕاستەڕێگای لێکۆڵینەوەکەمان بەرنادەین، چون بەدواگەڕانی ئەو هێما و زناک و ڕەمزانە لە ئوستوورە و ئەفسانە و بیر و دابانەدا، کاتێکی هێجگار زۆر و کەرەستەگەلێکی باشی دەوێ، حەوجێ بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆیە. لەم نێوەندەدا ئەوەندەی باسکرا کۆکردنەوەیەکی کورتی گرنگی ئەو بیروڕایانە بوو دەربارەی گوڵی نەیلۆفەر لە نێو گەلاندا. لێرەوە دەتوانین ئەم نیشانانە بێنینە نێو ئەدەبیاتەوە و بەراوردێک لە نێوان مەبەستی شاعیر و ڕاستی تایبەتمەندیی گوڵی نایلۆفەردا بکەین.

نالی، چاوی حەبیبەکەی کە خێل بووە، چواندووە بە دوو گوڵ؛ گوڵێکیان وەنەوشەیە کە شەوان دەگەشێتەوە، ئەوی تریان نەیلۆفەرە و لەگەڵ

---

[1]. بڕوانە: محمد جعفر یاحقی، فرهنگ اساطیر و داستان وارەها در ادبیات فارسی، ص: ٨٣٩.

[2]. هەمان سەرچاوەی پێشوو...

خۆرکەوتن تا دەمەوئێوارە گەش و کراوەیە، واتا ئەم دوو گوڵە کە کاتی گەشانەوەیان پێچەوانەیە، هاتووە بە خێلی چاوی مەحبووبەکەی چواندووە! دەکرێ بڵێم جوانترین واتای لێ خوڵقاندوون کە دەڵێت:

"چاوی هەمرەنگی گوڵی مەستی شەو و ڕۆژن مەدام

یەک لە نەشگوفتەی بەنەفشە، یەک لە نەیلۆفەر دەکا" (نالی، ٨٤)

شەو چاوێکیان مەستە، چونکە هێندە گەشاوەتەوە، ڕۆژیش چاوەکەی تری مەستە کە بە خۆرهەڵهاتن خەنی دەبێت...

سالم لە بەیتێکدا ئەو وێنەیەمان نیشان دەدات کە نەیلۆفەر لە ئاودا دەڕوێت و بە گریانی ڕووبارێکی ڕەوانی درووست کردووە و هەر برژانگی خۆشییەتی سەر ڕووبارەکە کەوتوون و بوونەتە نەیلۆفەرستان:

"چەشمەیی نەهری ڕەوان دیدەیی گریانی منە

موژە تا مەددی بەسەر، نیلووفەرستانی منە" (سالم، ٤٩٩)

"با غەریقی بەحری هیجرەت بم، وەکو نیلۆفەرێش

دوور بە دوور خۆ هەم بەرابەر؛ بەو جەمالی ئافتاب" (ئەدەب٦٠)

هەڵبەتە نەیلۆفەری بە واتای ڕەنگی نیلیش دەست دەدات، نالی لە بەیتێکدا دەڵێت:

"شەو چەپکەنی نەیلۆفەڕی و جیلوەیی ڕەقسی

شەرمندە دەکا زوهرەیی زەهرا لە سەمادا"     (نالی،٦٢)

# گوڵی ژاڵە

ژاڵە درەختێکە هەمیشە سەوزە، گەڵاکەی تاڵە، وەک بی وایە. گوڵی زەرد و سوور و سپی هەیە. [1] لە زمانی فارسیدا؛ (ژاڵە) بە چەند واتایەک بەکاربراوە، بەڵام زیاتر لەبری شەونم (ئاونگ) بەکاربراوە. لە شیعری کلاسیکی کوردیدا لەم جۆرە بەکاربردنە دەبینین کە ژاڵە وەک شەونم بەکاربراوە:

"چیچەک و گول سەحەرگاهان، نەستەرەنێن د خەر گەهان

تێکی ژ میسک و ماوەردێ، ماهێ خوناف و ژالە کر" (جزیری، ٢٧٠)

"دیدەت وەکو گوڵ سورە، پڕی شەبنەمی ئەشکە

یا لالەیی پڕ ژاڵەیە دوو نەرگسی شاهلات" (نالی، ١٠٩)

"نێرگسە چاوی، بەڵا نێرگسی شەهلایە، چ تەرح

لە نمی ژاڵە ببێتە فەڕ و زیپی چەمەنێ" (ئەدەب، ١٩٨)

دەبینین "ژاڵە" وەک گوڵیش لەلایەن شاعیرانەوە ناوبراوە و بە گوڵێکی بێ بۆن و بێ بەر و تاڵ ناوزەدیان کردووە، بڕواننە ئەم شیعرەی نالی کە کوڕی

---

[1]. هەرهەنگی خاڵ - فەرهەنگی دیوانی نالی

چواندۆتە "ژاڵە" و پێمان دەڵێت کە؛ ناشێ و نابێت تا قامەت-سەروو و سنەوبەرپی کچێک وەستابێت، چاوی وەک نێرگس کاڵ و مەست بێت؛ نارەوا و گوناهە ئەگەر بۆن بە گوڵی ژاڵەوە بکەیت و لێی ڕابمێنیت(کە مەبەستی لە کوڕە)؟

"بێ بێنە گوڵی ژاڵە هەم بێ بەرە هەم تاڵە

قەد سەرو و سنەوبەر کچ، چاو نێرگسی شەهلا کچ" (نالی، ١٢٧)

## گوڵەکانی دیکە:

ئەگەرچی شاعیران ناوی گوڵ و جۆرەکانی گوڵیان زۆر لە شیعرەکانیاندا بەکارهێناوە، بەڵام لەم بەکارهێنانەشدا هەندێ گوڵ بەخاتری تایبەتمەندێتی و هەڵکەوتە ڕووکەشەکەی، زیاتر لای شاعیران بەکاربراوە. ئێمە هەوڵماند لە سەرەتاوە بەپێی زۆری بەکارهێنانی ناوی گوڵەکان یەک بە یەک باسیان بکەین، کە گوڵی نێرگس و سونبول و لالە و...، ئەمانە لەو جۆرە گوڵانە بوون کە زۆرترین بەکارهێنانیان هەبووە و لای زۆرترین شاعیریش بەکاربراون، وەلێ هەندێ گوڵیش هەن کە لای ژمارەیەکی کەم لە شاعیران ناویان براوە و کەم بەرچاومان دەکەون، بۆیە لێرەدا باسیان ناکەی بەهۆی کەمی، یان هەر بەکارنەهێنانیان لەلایەن شاعیرانەوە. ئەم گوڵانە هەریەکی چەند جارێک بەکاربراون لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، وەلێ هێندە جێی بایەخ نەبوون تا لەسەریان بوەستین و لێیان وەکۆڵین: (گوڵی هێرۆ، گوڵی ئەرغەوان، گوڵی کەنێر، گوڵی بەیبون، گوڵی وەتاغی، گوڵی گەزیزە، گوڵی قەدیفە، گوڵی شەستپەڕ، گوڵی خاو( کە ڕەمزێکە بۆ زوڵف و بۆنی خۆش)، گوڵ ئاتەشی(ئەمیش ڕەمزە بۆ ڕووخسار و لێو).

# ڕەمزە عیرفانییەکان لە ئەدەبیاتدا

وەک چۆن دنیای کلاسیک و پێش مۆدێرنە، خاوەنی چەند تایبەتمەندییەک بووە تایبەت بە خۆی کە لە دنیای نوێ و مۆدێرنەدا نییە؛ شیعری کلاسیکیش بە هەمان شێوە چەند تایبەتمەندیەکی جیاوازی لەچاو شیعری ئێستادا هەبووە. ئەم تایبەتمەندییانە بە شێوەی ڕەمز و هێما بەکاربوارن و کەسێک گەر بیەوێت لە شیعری کلاسیک تێبگات؛ نیازی بەوەیە ئەم هێما و ڕەمزانە بزانێت و بیانکاتە دەلاقەیەک بۆ چوونە نێو دنیای کلاسیک. ئەم ڕاز و ڕەمزانە بە مەعریفەتی شاعیر تەندراون، بۆ لابردنی گەرد و تۆزی سەر ئەم ڕەمزانە و هوەیدابوونی ڕازی شیعرەکان؛ هەڵوەداپی و کونجوکۆڵییەکی زۆری پێویستە... بەیانکردنی 'مەبەست' لە شیعری کلاسیکدا؛ بۆ مەردوومی ئەم سەردەمە ئاشکرا و ساکار نییە، حەوجێی بەوە هەیە کەسی خوێنەر فرەزان بێت لە رەمزە عیرفانییەکان، چونکێ بابای شاعیری ئەوکات، بەوپێیەی دەرچووی حوجرە و مزگەوت و عەرەبی و فارسیزانێکی باش بوون، هێندە خاراوبوون لەو بابەدا کە تێگەیشتن لێیان گەلێک قورسە، بەتایبەت بۆ مەردوومی ئێستا. بە خوێندنەوەی شیعری کلاسیک، سەرت سووڕ دەمێنێت و ئاوەزت وڕ! کاتێک دەبینیت شاعیرێک لە پەنا و پەسێوی لادێیەکدا، یان کوچە و سوقاقی شارەدێیەکدا، چۆن ئاگاداری ئەم هەموو زانستە بووە! ئەگەر لاپەڕەی دیوانە شیعرییەکان هەڵوەدەین؛ پڕن لە داستان و ئەفسانەکانی پێشینی مرۆڤ کە مێژوویان لەبەر کۆنی هەر ناشزاندرێت! سا چۆن ئەم

ئەفسانانە گەیشتوون بەوان و ئێستا ئێمە هیچیان لێ نازانین؛ نازانم لەمەدا ئینسان سەراسیمە دەبێت!! سەردەکەیتە هەر سەرچاوەیەک لەم دنیای تەکنالۆژیایەدا؛ سۆراغی "بابای عەیار"ێک لە سەرچاوەیەکدا نابینیتەوە، کەمەکێک زانیاری پچڕ پچڕ و لێک جیاواز نەبێت کە یەک ناگرنەوە، کەچی نالییەک دەیکاتە هەوێنی بەیتێکی و دەڵێت:

کە دیتم شەکڵی سەد ڕەنگی، گوتم بابای عەیارە

کە بیستم لەفزی بێدەنگی، گوتم شەیپووری شاپوورە!!

سا شەکڵی سەد ڕەنگی بابای عەیار چۆن بووە و بابای عەیار کێ بووە؟ هێشتا دیاری نەداوە، لەفزی بێدەنگی شەیپووری شاپووریش لەولاوە هەر بۆستێت!

ئەبێ خوێنەر لەوە تێبگات کە مرۆڤی ناو شیعری کلاسیک؛ مرۆڤی ئاسایی نییە، دڵبەر و یاری ناو شیعری کلاسیک، مرۆڤیکی ئاسایی نییە، زوڵف و پەرچەم، لێو و زار، چاو و جەماڵ، مەیخانە و خاڵ... بەکاربردنێکی دنیایی نین، بەڵکە درکەن، پیشاندانێکی دنیایەکی دیکەن، ئەو دنیا عیرفانی و ڕۆحانییەی پێش مۆدێرنە هەبووە، یان دنیایەک لە ڕەهەندێکی تر. شیعری کلاسیک لێوانلێوە لە دەستەواژە عیرفانییەکانی وەک: (زوڵف، خەت و خاڵ، چاو، لێو، ڕوو، مەی و شەراب، مەیخانە، کاسە و پیاڵە و قەدەح، ئاوی حەیات، پیر، شۆخ، بت و سەنەم، بای سەبا، خەرابات، زوننار، حور و غیلمان، موغبەچە...) ئەم دەستەواژانە بە مەبەست بەکاربراون، بۆ ڕێگاوننەکردنی شیعری کلاسیک، ناچاری ئەم ڕەمزانە

دەبیت کە بیزانیت. وا بە کورتی لەسەر چوار دەستەواژە و ڕەمزی عیرفانی تێکەڵ بە ئەدەبیات دەدوێین کە پەیوەستن بە بابەتەکەمانەوە و دوان لەبابەت هەموو دەستەواژەکان؛ کار و هەوڵدانی سەربەخۆی دەوێت...

# زوڵف

**"بنازم بە کوفری زوڵفی تۆ ئەی ئافەتی ئیسلام**

**کە ئەستۆبەندی جیزیەی خستە مل ئیمانی خاسی عام"**

**" مەحوی"**

کاتێک بمانەوێت لە "زوڵف" وەک ڕازێک تێبگەین، پێویستیمان بە تێگەیشتن دەبێت لە ڕەمزی "ڕووخسار"، چون ئەم دووانە ئەڵقەی دوابەدواهاتووی یەک زنجیرن. "ڕووخسار" لە عیرفاندا واتا دەرکەوتنی جوانی زاتی خودا، لەوەدا کە خودا ڕووووناکییە، ڕۆژە، نوورە(**اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ)**[1]، مادامەکی نوری خودا "ڕووخسارە"؛ لەسەر وێنەی ئینسان ئەم ڕووە بە "زوڵف" دادەپۆشرێت، کە نیشانەی داپۆشینی جوانی و جەمالی زاتی حەقە:

"لە سایەی کوفری زوڵفت، دڵ ((فەنا فی النور))ی ئیمانە

مەڵێن زوڵمەت خراپە، وەسڵی پەروانە لە شەودایە" (نالی، ٤٦٢)

مامۆستا مەسعود محەمەد لە ڕافەی ئەم بەیتەدا دەنووسێت: "زوڵفەکەی داناوە بە (کفر) لەبەر سەختی و خەستیی ڕەشایی ڕەنگەکەی، کفریش 'شاردنەوەی ڕاستییە'، لەوەڕا زوڵفەکە و کفر هەردوویان وەک

---

[1]. القرآن الكريم - سورة النور – الآية 35

یەکترن؛ چونکە زوڵفەکەش ڕووناکایی ڕووی داپۆشیوە. ڕووەکەش وەک 'نووری ئیمان' وایە، لەبەر زێدە پاکی و سپییەتی و بێ گەردی...

نالی هەرچەندە ناوی 'ڕوو' ناهێنێ، بەڵام بەهۆی تێکڕای مانای بەیتەکە، بەتایبەتی لە وشەی زوڵفەوە، لزووم بەوە نەماوە ناوی بێنێ... [1]" لە لێکدانەوەی دیوانی نالیدا مامۆستایانی مودەڕیس وایان فەرمووە کە "فنا فی النور" لە زاراوەیەکی سۆفییانەوە وەرگیراوە، لای ئەهلی تەسەووف سێ پلە هەیە بۆ سۆفی بەر لەوەی ببێت بە پیاوێکی تەواوی خودا، پلەی یەکەم؛ (فنا فی الشیخ)ە کە هەمیشە بیر لە شێخ دەکاتەوە. دووەم؛ (فنا فی النبی)یە، ئەمەیان قۆناغێکی لەپێشترە، سۆفی هەر بیر لە پێغەمبەر(ص) دەکاتەوە و هەست بە یەکێتی دەکات لەگەڵی. سێیەم؛ (فنا فی الله)یە کە هەرە بەرزترین پلەی خواناسییە و سۆفی لەو پلەیەدا هەمیشە بیر لە خودا دەکاتەوە و لەو بەولاوە، هەچی بۆ گرنگ نییە، وا دەزانێ لەگەڵ ئەودا یەکی گرتووە. نالی هیچ کام لەم قۆناغانەی نەویستووە و لە ڕووناکایی ڕوومەتی یاردا تواوەتەوە و ئەوی بە ڕووناکایی ئیمان داناوە، بەم جۆرە سۆفییەتییێکی تایبەت بە خۆی درووست کردووە...[2] مەلای جزیری لەبابەت زوڵفەوە غەزەلێکی هەیە کە مامۆستا هەژار ناوی لێناوە "موبتەلای زوڵف" تێیدا بەوردی باس لە زوڵف و تایبەتمەندییەکانی دەکات، ئەم دوو بەیتەی باس لە داپۆشینی ڕووی یار دەکات، چون سێبەر و تاریکایی زوڵفی بەسەردا دێت:

[1]. مەسعود محەمەد، چەپکێک لە گوڵزاری نالی، چاپی دووەم ، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل: ٧٨.
[2]. مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس-فاتیح عەبدولکەریم، دیوانی نالی،نشر پانیذ، چاپی دووەم، سنە، ١٣٩٦ هـ، ل:٤٦٢.

"سەر ددت ئابی کەوسەرێ، زەمزەمە و سەمایێ زولف
سایە نومایێ خاوەرێ، سیدرەیێ مونتەهایێ زولف
سایەنومایێ جەبهەتێ، نەقش و خەتێ ژ قودرەتێ
نوقتە و حەرف و جەزمەتێ، بال و پەر و هومایێ زولف" (جزیری، ٣٦٩)

بەیتەکانی دواتریش هەمان مەبەست دەدەن بەدەستەوە... مەحوی شاعیر لە بارەی کوفر و تاریکی زوڵف و نووری ڕووی یاردا دەڵێت:

"زاهید ئەو زوڵفەی لەسەر ڕوو دی، وتی:
کوفری وا ڕوو پۆشی ئەم ئیمانە بۆچ؟!" (مەحوی، ١٣٠)

"بە حەڵقەی کوفری زوڵفت تێکەڵە دڵ
دەسا هەڵسە، دەخیل وەختی غەزاتە" (سالم، ٥٤٠)

یان ئەم بەیتەی نالی کە زۆر بە ڕوونی ئەم وێنەیەمان نیشان دەدات، نوور و تاریکی و ڕوو و زوڵفی یاری تێدا کۆکردووەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا باسی ویساڵ و فیراق دەکات، ڕۆژی(کە مەبەست ڕوویەتی) بە ویساڵ و پێگەیشتن داناوە و شەویش(کە مەبەست زوڵفییەتی)ی بەفیراق و دووری:

"مەعنایی نوور و زوڵمەت و نەشری حەیات و مەوت
بوو، ڕوو و زوڵف و ڕۆژی ویساڵ و شەوی فیراق" (نالی، ٢٠١)

زوڵف لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا چوار مانای هێماگەری سەرەکی هەیە،

١. فرەیی و پلەیی دەرکەوتنی بوون.

٢ ڕووبەندی ڕووخساری دەرنەکەوتووی خودا.

٣. دەرکەوتنی جوانی و شکۆی خودا.

٤. ڕێگای سللوک و گوریس و کەمەندی ڕێنمایی.[1]

زوڵف، پەرچەم، گێسوو، کەزی، توڕڕە، موو... هەموو ئەمانە درکەن بۆ ئەم ڕەمزە عیرفانییە. کاتێک زوڵف و پەرچەم دەشێوێن و بژ دەبن؛ دەبنە ئەڵقەی داو و لە گەردەن و ئەستۆی شاعیر دەئاڵێن. مەحوی دەڵێت:

"بناگۆشی لە چینی زوڵفیا دەرکەوتبوو، دەت وت

ئەمە بازی سپیی سوبحە، چووە بن باڵی زاغی شام" (مەحوی، ٢٤٠)

زوڵفی کراوە و شێواو لە هێماگەریی هیندیدا، ڕەمزی خوداوەندی ترسناکە.[2] لە شیعردا بە واتای جوانی، بۆنخۆشی، ڕەشی و داوی بەڵا هاتووە. "عێراقی وتوویەتی: درێژی زوڵفی جانان ئاماژەیە بە بێسنووری بوونەوەرانەوە، چونکە زوڵف پەردەی ڕووی دڵبەرە..."[3] نالی لەم بارەیەوە دەڵێت:

"سەری زوڵفت کە ڕشتەی عومری خزری نیوە هەودایە

---

[1]. مقاله: دکتر حيدر قليزاده، زلف و تعابير عارفانه و عاشقانه آن در شعر فارسي.
[2]. ئەحمەدی مەلا، مەحوی لەنێوان باتینییەت و سەرچاوەکانی عیشق و وێنەی مەعشوقدا، ٣٧.
[3]. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، ١٧٦.

چ هەوداێ کە هەر حەڵقێکی سەد زنجیری سەودایە"[1]

جودابوونەوەی سەری زوڵف لە جەستە، ئاماژەیە بە دەرکەوتنی نووری یەکتایی.[2] وەک لە باسی گوڵەکانیشدا لەسەری ڕۆیشتووین، زوڵف بە گوڵ چوێندراوە بە خاتری نەرمی و بۆنخۆشی شێوەی گوڵەکان، هەروەها ئاماژەمان بەوەش کردووە کە زوڵف وەکوو هێمایەک بۆ ماریش بەکار هاتووە:

"دو جادوو ماری مەغزی ئادەمی خواری قەرار داوە

لەسەر شانی وەکوو زەحاک و ناوی ناوە زوڵفەینی" (نالی، ٥٦٢)

ئەمانە و زۆر نموونەی دیکە کە لەسەر زوڵف هەن، وا دەکەن ڕەمزگەلێک درووست بین کە خوێنەر بە سادەیی لە بەیتەکان تێنەگات. بۆ نموونە لە هێماگەرایی میسرییە کۆنەکاندا؛ ئەڵقەی زوڵف بە واتای ترس بووە.[3] لەوەدا کە زوڵف لە شیعردا جێی ئاشووب و ترسە؛ یەک دوو نموونەی نالی و مەحوی دەهێنینەوە کە لێکچوونێکی زۆریان لە نێواندا هەیە، دیارە نالی لەمەدا پێشتر ئەم شیعرەی وتووە، تێیدا باس لە ئەڵقەی زوڵف دەکات کە ئاماژەیە بۆ ڕەشمار و ترساندنی شاعیر:

"تالیی لێوین و ئەڵقەی زوڵفمان نیشان دەدا

ڕاڕەوی میسرین و ئەو ڕوومان لە موڵکی چین دەکا" (نالی، ٨٦)

---

[1]. ئەم بەیتەمان بەپێی بۆچوونی مامۆستا مەسعود محەمەد نووسیوە، لە کتێبی: "چەپکێک لە گوڵزاری نالی"، ل:٧٣.

[2]. . ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، ١٧٦.

[3]. ژان شوالیە، الن گربران، فرهنگ نمادها، جلد ٣، ص:٢٦.

"عەنبەری سارا وتم زولفی، نەباتی میسرِی لێو
زوڵفی ئاڵۆزا، وتی کە ناوی من نەبات!"          (مەحوی، ٩٤)

لەم دوو بەیتەدا، دەرکەوتنی زوڵف وەک ترس هاتووە، لە کاتێکدا بەیتەکەی مەحوی، 'زوڵف ئاڵۆزان و شێوان'ی تێدایە، کە وەک پێشتر ئەوەمان وتبوو کە لە هێماگەریی هیندیدا نیشانەی خوداوەندی ترس بووە!! دەبێت شاعیران چۆن لەم کەین و بەینە شارەزا بووبن؟! گەر نموونەیەک لەبابەت زوڵف بهێنینەوە کە لەپاڵ ماردا بەکارهاتبێت، گەلێک نموونەمان چنگ دەکەون. سالم لە بەیتێکدا زوڵف و ماری کۆکردووەتەوە و ڕووی یاریشی بە ئاگر چواندووە، بە یار دەڵێت: چییە داخۆ سیحرت کردووە وا ئاگرت بە ڕەشماری زوڵفت داپۆشیوە، مەگەر دەگونجێت؟:

"خۆ زوڵف و ڕوخت زددی یەکن، سێحرەکە سازن!
خستوویەتە ژێر ماری سییەھ، دۆشەکی مشکوو!"          (سالم، ٤١١)

لە ئەدەبیاتی فارسیدا سەد ناوی تر لەپاڵ زوڵف و موودا بەکاردەبرێن، ئەم ناوانە ئەگەر لە شیعردا بێن؛ خوێنەر دەبێت تێبگات کە مەبەست لە زوڵفن و وەک ڕەمزن بەکاربراون، بۆ نموونە: سەمەنسا، وەنەوشە،

سونبول، میسک و عەنبەر، کەمەند، تار و مار، کافر، گوڵپۆش، سەرکەش...[1]

[1]. دکتر منوچهر دانش پژوه، فرهنگ اسطلاحات عرفانی، چاپ دوم، نشر فرزان، تهران، ١٣٨٦هـ، ص: ٨٥.

## خەت و خاڵ:

**"پور ژ دیم و خەت و خالان تە خەبەر دایە مەلا**

**نەزەرێ وەر بدە بەژنێ ژ موفەسسەر مەکە بەحس"**

**"جزیری"**

لە شیعری شاعیرە عاریفەکانماندا؛ چەمکی 'خەت' و 'خاڵ'، بە ڕێژەیەکی بەرچاو بەدی دەکەین، بۆ نموونە لای جزیری و مەحوی و نالی... ئەم بەکاربردنی دەستەواژە عیرفانیانە لای شاعیرانی پاشتریش دەبیندرێت، وەک: سالم، وەفایی، ئەدەب... بەڵام قسە لەسەر ئەوەیە کە ئایا بە مەبەستە عیرفانییەکە بەکاریان هێناوە، یان مەبەستی تر؟ ئەوەش ماوە کە بڵێین ئەو شاعیرانەی پاشتر عاریفن، یاخود نا؟(ئەوەش بۆخۆی بابەتێکی جودایە.) ئەمما قسە لەسەر عاریفبوونی مەحوی نییە، هەرچەندە پاشی سالم و کوردیش هاتووە. خەت و خاڵ دوو چەمکی جودان، بەڵام پێمان باش بوو لە یەک شوێندا کۆیان بکەینەوە.

خەت لە ئەدەبیاتدا بە گەنەمووی تازە ڕواوی سەر ڕووی نازداران وتراوە، لە کوردەواریدا وا باوە، گەر کەسێک سمێڵی بۆز بکات؛ پێی دەڵێن: (فڵان کەس خەتی داوە.) یان جاران لە داوێنی لێوی خوارووەوە بۆ سەر لووتکەی چەناگە، نەخشێکی سوونیان ئەکوتا، بەوەشیان دەوت خەت.[1]

"خـەتی دەوری لـێوی ئاڵـت ئـەی مەسـیحا لام و بێ

[1]. دیوانی نالی بە لێکدانەوەی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، ٢٢٣.

هەر لە جامەی سەبز ئەچێ بۆ غەین و نوون و چیم و هێ" (مەحوی، ٣٤٠)

"چ شیرینە خوتووتی دەوری لێوت

بەڵێ مەعلوومە خۆشە خەتتی یاقوت" (نالی، ١٢٠)

خەت لە عیرفاندا پەیوەستە بە مرۆڤی کامڵەوە، کە "عەرەبی" بۆ یەکەمجار لێی دواوە، مەبەست لە مرۆڤی کامڵیش؛ حەقیقەتی محەمەدییە. [1] خەت لە شیعری کلاسیکدا، زۆر جاران لەگەڵ زوڵفدا دێت، بەدەر لە لێو:

"لەشکری خەتتی شکستە و تیپی زوڵفی تار و مار

پادشاهی حوسنی عالەمگیری هێشتا غالیبە" (نالی، ٣٢٨)

دکتۆر ئەحمەدی مەلا، لە کتێبەکەیدا کە تایبەت بە مەحویە، دەنووسێت: "گەندەمووی دەوری لێو و گونا، گەندەموویەک کە دەوری یاقوتی لێو دەدات، دەبێ ئەم گرنگی دانە بە گەندەموو لە کوێوە هاتبێت؟ لە هەمان کاتیشدا بە جوانی دەچوێندرێت..! لە دونیای ڕەمزی سۆفیگەریدا، گەندەموو ئەو ڕێحانەیە کە پێغەمبەر(ص) بە خۆشترین بۆنی چواندووە... هەر لێرەشەوەیە کە وەک دەرمان بەکاردەهێندرێت بۆ چاککردنەوەی چەندین نەخۆشی، لای مەحوی چارەسەری نەخۆشییەکی کوشندە دەکات، ئەویش عیشقە...

[1]. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، ١٣٠.

له لایەکی دیشەوە، کاتێ گەندەموو دەوری خاڵ دەدات، ئەمە مانایەکی زۆر تایبەتی دەبێ، کاتێ تێکستەکەی شەبستەری دەخوێنیتەوە، دەمانباتە جیهانێکی ڕەمزی و زیهنییەوە، چونکە بۆ ئەو: گەندەموو نەش و نمایە لە دنیای ڕۆحانی. ڕەشیی زوڵفیش شەو دەکاتە ڕۆژ و شوێنی ئیقامەتی ژیانە...[1] ئەویش بزانە کە دڵ عەرشی خودایە لەسەر ئاو و گەندەمووی دەوری گۆناش بە ئارایشی ڕۆح دەزاندرێت..."[2] مەحوی دەڵێت:

"تا لە دەوری لێوی ئاڵی خەتتی سەبزی بوو عەیان

عاشقانی جوملە وەک بەنگیی دەبینم گێژ و وێژ" (مەحوی، ١٧٤)

"خاڵ، لای ڕێبوارانی تەریقەت و ئەهلی چەشن خاڵی یەکێتی حەقیقەتە... هەندێک دەڵێن: خاڵ بریتییە لە تاریکی گوناھ کە نێوان نووری گوێڕایەڵیی پەردەبوو، چونکە چاکە کەمبوو، خاڵیان پێ گووت، هەروەها خاڵ درکەیە لە یەکێتیی خودیی ڕەها..."[3]

"ب خالێن وەرد و نەسرینان، ژ قودرەت خەت کشاندی لێ

ب تەرحا نێرگزا عێلی سەحەرگاهان نەسیم لێ دا" (جزیری، ٦٩)

لەوەدا کە خاڵ، لای شاعیرە عاریفەکان کەعبەی وەفادارانە؛ ئەم وێنەیە لەوەوە هاتووە کە کەعبە خانوویەکی شەش پاڵووی ڕەشە، ماڵێکی ئەزەلییە

---

[1]. ڕەنگە هەڵەی چاپ بێت، دەنا ڕەشی زوڵف ڕۆژ دەکاتە شەو، نەک شەو بکاتە ڕۆژ..

[2]. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و سەرچاوەکانی عیشق و وێنەی مەعشووقدا، ئەحمەدی مەلا، ل٤٠.

[3]. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، ١٢٦.

و ناوکی جیهانە. "شەمستەری"، کە شاعیرێکی عاریف بووە؛ خاڵ بە شوێنی گەیشتنی دونیا و حەقیقەت دادەنێت[1]

زۆرجار ئەم خاڵە دەبێتە تەڵە و داوێک بۆ گرتنی نێچیر بە ئەڵقەی زوڵف، دانێکە و ڕۆکراوە، کەسی نائاگا و مەست بەو داوەوە دەبێت،

"داوێکە لە ڕووی دانەیی خاڵت تەنراوە

زنجیرە لە پێی مائیلی ئەو ڕووتە نراوە" (نالی، ٤٣٩)

"زوڵفی بە دەوری خاڵەکەیا دێ، هەموو دەمێ

'مەحوی' ببینە عەنبەری سارا غوڵامی میسک" (مەحوی، ٢١٣)

1

# چاو

**"چـاویشی لە 'نالی' کرد، دین و دڵ و جـانی برد**

**گەر زوڵفە ئەگەر نازە، گەر خەندەیە گەر چاوە"**

**"نالی"**

چاو لە عیرفاندا بریتییە لە ئاگاداری زاتی حەق، خودا دەفەرموێت: ((إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ))[1]، خودا بینەر و ئاگاداری هەموو شتێکە، هەروەها دەلالەتیشە لە جوانی. چاوی حەق، بریتییە لە خودی حەق. شوێنی زانستی خودا؛ بینینیەتی، مەبەست لە بینینی خودا؛ تەنیا دەرکەتنی زانستەکەیەتی لە وێنەیەکی دیاردا، مەبەست لە زانستی خوداش؛ سەیرکردنە لە زانستی ڕاستەقینە...

لە بارەی ئاگایی و هۆشیارییەوە؛ ئەم وێنایە پەڕیوەتە شیعرەکانی مەحوییەوە و لە بەیتێکدا، لەبەرچاوڕۆیشتنی ئەو بە نائاگایی و بێ هۆشی خۆی دادەنێت و دەڵێت:

"کە تۆ غایب لە بەرچاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غایب

قیامەت حازری بەرچاومە، خۆمم لە تۆ غایب!" (مەحوی، ٨٦)

لە شیعری کلاسیکدا شاعیران بە دوو جۆر ڕەمزی چاویان بەکار هێناوە، یەکێکیان چاوی یارە، ئەوی تریان چاوی خۆیەتی، ئەمەش چەند چاوێکە.

[1]. قورئانی پیرۆز، سورەتی: غافر، ئایەتی: ٤٤.

لای سۆفییەکان؛ هۆش و گیان، نهێنی و دیارەکان، هەریەکەیان چاوێکن. بەڵام پایەی چاوی هۆش، بینینی نووری ئایەتەکانە. پایەی چاوی دڵ یەقینە و ئەویش بینینی نووری سیفەتەکانە. بەڵام چاوی گیان پایەی دڵبینی خودە و پایەی چاوی نهێنیی شهودی، بینینی غەیبە بە غەیب، چاوی دیار هەر جارێ لە بێگەردی ئایەتەکانا کامڵ دەبێ و وەکو چاوی دەروونی لێ دێت، هەرشتێ کە دڵ و فوئاد سەیری بکەن دەیبینێ، پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی: ئەو ڕۆژە ڕووخساری گرووپ لە شادی دەبریسکێتەوە و نوورانییە و پەروەودگاریان دەبینن... پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: خوای خۆم بە چاو و دڵی خۆم بینیوە..."[1] مەحوی لە بارەی چاوی سەر و چاوی دڵەوە دەڵێت:

"غایب لە دیدە، چاوی سەرم، دڵمە پێتەوە!

دەستم بە ئاسمانەوە، چاوم بە ڕێتەوە" (مەحوی، ٣٠٥)

چاو لە ئەدەبیاتدا بە سی و سێ ڕەمز دەورە دراوە، واتا لەبری چاو سی و سێ بەکاربردنی تر هەیە کە مەبەستن لە چاو، بۆ نموونە: نێرگس، بادام، خەواڵوویی، گوشەنشین، خەتایی، تورک، جادو، مەست فیتنە...[2] ئەم ڕەمزانە لە ئەدەبیاتی فارسدا زۆر بەکاربراون، وەلێ لە کوردیشدا ڕێژەیەکی بەرچاو بەکارهێنانی ئەم دەستەواژە و ڕەمزانەمان هەیە کە شاعیرانی کلاسیکی کوردی بەکاریان هێناون، نالی زیاتر لە شاعیرانی تر ڕەمزی چاوی بەکارهێناوە و لەو پەسنانەی بۆشی کراوە، هەر دەستێکی باڵای هەبووە:

---

[1]. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، ١٠٣.
[2]. بڕوانە: دکتر منوچهر دانش پژوه، فرهنگ اسطلاحات عرفانی، ص: ١٠٠.

"وەها مەستی تەماشای چاوتە نالی کە نازانێ

بە بێداری دەبینێ یا لە نەشئەی مەستی و خەودا" (نالی، ٦٧)

چاو بکوژە، جەرگی عالەم دەبڕێت، عەزاب و میحنەتە بۆ شاعیر، داوێکە و شاعیر پێی لێی گیر دەبێت، بە سەیرکردنێکی یار؛ شاعیر دڵ و جەرگ و هەناوی لەت لەت و کوت کوت دەبێت. ئەم وێنایەش دووبارە دەچێتەوە سەر ڕێچکەڕووبارێکی عیرفانی، لەوەدا کە وتمان چاو هێمایە بۆ لوتف و عینایەت و ڕوانینی ئیلاهی، ئەو یارەی لە شیعری کلاسیکدا هەیە و ئەم چاو و ڕوانینەش کە باس دەکرێن؛ هەمووی گوزارشتە لە زاتێکیتر و جیهانێکیتر. لەم ڕووەوە مەلای جزیری لە بەیتێکدا دەڵێت:

"ژ هەردو چەشمێن تەی مەست و خونرێز

نوورا دو چەشمان کێ دی سەلامەت" (جزیری، ١٧١)

"چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی میسکین دەکا

مەستە مەیلی چەن کەبابێکی دڵی خوێنین دەکا" (نالی، ٨٦)

"لەپڕ ئەو چاوە هەڵدەبڕێت و جەرگی عالەمێ دەبڕێ

نییە، هەر بەرقە غەمزەی دڵ شکافێ، بێ تەریق ئەمما" (مەحوی، ٦٥)

"بە نەشئەی سستی و مەستی وەها موستوور و مەخمووره

نـزانـم خـەو لە چـاوتدایـە، یـا چـاوت لە خـەودایـە!!" (نالی، ٤٦١)

چاو، هەر خۆشی دەبێتە هەتوانێک بۆ نەخۆشی شاعیر و بیماری شاعیر سارێژ دەکا، نالی دەڵێت:

"تەبیبی من دەبێ دەخڵی هەبێ سەحێب ئیشارەت بێ

مەگەر چاوت بزانێت من لەبەر چی مەست و بیمارم" (نالی، ٢٢٢)

بۆچی چاوی مەست بە چاوی ئاسک چوێندراوە؟ ڕەنگە ئەمە پەیوەندی بە چەند بابەتێکی ترەوە هەبێت، لە ڕاستەڕێگای خۆمان لامان بدات، وەلێ کە شاعیر دەڵێت:

"ئەی خەستەیی چاوت هەموو ئاهوویی تەتاری

وەی بەستەیی زوڵفت هەموو شێرانی شکاری" (نالی، ٥٣٧)

ئاهووی تەتاری: بە جۆرە ئاسکێکی چاوجوان دەڵێن. لێرەدا دەبێ بڵێن چاوی ئاسک بەدەر لە جوانییەکەی، مەست و خواڵووش دەنوێنێت. لە سەردەمی خەلافەتی عەباسییەکاندا تاقیکرنەوەی مەستبوون لەسەر کۆمەڵێک ئاژەڵ کراوە، لەوانە:حوشتر، گامێش، گا، ئەسپ، بەراز، ئاسک، کاوڕ، هەڵۆ، سەگ، مار... ئەوەی بە چاکی هاتۆتە سەر هەوەس و بە خواردنەوەی شەراب مەست بووە و کاری لێکردووە، ئاسک بووە![1]

---

[1]. بڕوانە: خوسرەو جاف، حەرەمسەرا و خەساوەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، س:٢٠١١، ل: ٥٦.

برۆ و برژانگ لەگەڵ چاودا دێن، هەموو جار ئەم دووانە تیژ و بڕندەن، ناوەکانی وەک: خەنجەر، شیر و شمشێر، تیر..ئەمانە؛ بێڕەحمانە شاعیر هەنجن-هەنجن دەکەن:

"من لە سیرڕی حیکمەتی چاوت عەجەب ماوم، عەجەب!

ئەو نەخۆشە خوێنی قەلبی من بە موژگان بەر دەدا" (وەفایی، ٣١)

"برۆت تیغێکە وسمەی سەیقەل و موسلوول و مووکارە

کە عیشوەی جەوهەرە، ڕەمز و ئیشارەی ئاوی مەودایە" (نالی، ٤٦١)

موژگان، یان برژانگ، وەکوو تیر ناوی هێندراوە و برۆش بۆتە کەوانێک بۆی، ئەم تیرە دڵی شاعیر دەکاتە نیشانە و دەیکاتە قوربانی، لە هەمان کاتدا برۆ ئاماژەیە بە هیلال، هیلال مژدەی هاتنی مانگێکی نوێی پێیەن موسوڵمانان زۆر جاران دەیکەنە نیشانەی مانگی قوربان، ئەم هیلالی برۆیە کە تیرەکەی لێ دەبێتەوە؛ ئاماژەیە بە بوونی قوربانییەک کە شاعیرە، یاخود پێویستە بۆ ئەم ساتە قوربانییەک بکرێت کە دووبارە هەر شاعیر دەبێتەوە نیشانە و قوربانی...

"برۆ داگرتنت عوششاقی پێ چوونە شەرارەی مەرگ

دەها مەرگ ئینتیزارێکن بە ئەمرێکی برۆ ڕۆیین" (مەحوی،٢٧٤)

"موژگانی و ئەبرۆی تۆ؛ ئەم تیر و ئەو کەمانە

سینە و دڵی ئەفگارم؛ ئەم سەیدە، ئەو نیشانە" (سالم، ٤٩٧)

"بێ جوی بوونەوەیێ زەخم و برین و ئەسەرێ

تیری موژگانی درێژت لە جگەر تێ دەپەڕێ" (نالی، ٥٤٠)

برۆ، لە بارێکی تردا ئاماژەیە بە میحراب، بە خاتری ئەوەی کە کەوانەییە، هەروەها میحراب شوێنێکە بەرەو قیبلە، لە وشەی (حرام)ەوە وەرگیراوە، بە ماڵی خودا(کەعبە) دەوترێت کە بێ لە موسوڵمان کەسانی تر لەسەریان حەرام کراوە بچنە ئەوێ. ئەم بوون بە میحرابە دووبارە بۆتەوە بە وێنە لای شاعیرانی کلاسیک، مەحوی دەڵێت:

"وا موشەووەش بوو کە میحرابی برۆتی دی ئیمام

ئیزنی خەلقی دا کە دنیا ئاخرە ، بۆ دێنە نوێژ" (مەحوی، ١٧٤)

لێرەدا مەحوی دەڵێت کە برۆی ڕەشی تۆ وەک مانگی هیلال نواندوویەتی، لەهەمان دەمدا؛ ئیمامیش لە میحرابەکەیدا کە برۆ ڕەشەکەتی وەک میحراب بینیوە و کەوانەییە؛ لێی تێکچووە و وای زانیوە مانگ نەماوە و قیامەت هەستاوە، چیتر بە پێویستی نەزانیوە نوێژ بکرێت، چون قیامەت کە بێت، خەڵکی عیبادەتیان لەسەر نامێنێت!! نالیش لە بەیتێکدا ڕوو دەکاتە ئەو یارەی لە شیعری کلاسیکدا هەیە و نیازیەتی بڵێت ئەگەر نوێژێک لە میحرابی برۆی تۆدا نەبێت، ئەگەر ڕووم لە تۆ نەبێت، ئەوا بەتاڵە و بێسوودە:

"بێ نییەتی تەقبیلی دەمت عاتییلە ڕۆژووم

بێ حەزرەتی میحرابی برۆت باتیلە نوێژم"     (نالی، ٢٢٧)

# لێو

**"لێوی هەر هاتە قسە، ڕۆحم چووە**

**بۆ سوئالێ ئەو، بەڵێ ڕۆحە زەواب"**

**"مەحوی"**

لێو لە عیرفاندا بە واتای گیان دەرچوون و ڕۆحکێشان هاتووە، دیارە ئەمەش دەچێتەوە سەر ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ((وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ))[1] ئەم ئایەتە ئیشارەتە بە ڕۆحبەبەرداکردنی ئادەم لەلایەن خوداوە، لێرەوەیە شاعیرە عاریفەکان ئەم ڕەمزە بەکاردێنن و لە نێوان لێو و ڕۆحدا جوانییەکی بێ هاودا دەخولقێنن. مەحوی شاعیر دەڵێت:

"کە بێ لێوی لەسەر لێوم بنێ، ڕۆحم لەسەر لێوە

کە لێوی لابەرێ، ئەڵبەتە ڕۆحم دەردەچێ پێوە" (مەحوی، ٣٠٩)

مەحوی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر یار لێوی بێنێتە سەر لێوم؛ ئەوا ڕۆحم لە خۆشیاندا دێتە سەر لێوم، بەڵام ئەگەر لێوی لاببات؛ ڕۆحم دەکەوێتە خوارەوە و گیانم دەردەچێت، چون ڕۆحم لەسەر لێو بووە... ئەم بەکاربردنە لای مەحوی زۆر ڕەنگی داوەتەوە، دیارە ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەربوونی مەحوی بە شاعیرانی فارس، سەعدی و حافز بە تایبەتی، چون دەستەواژە عیرفانییەکان لای ئەوان بە ڕێژەیەکی زۆر

[1]. قورئانی پیرۆز، سورەتی: الحجر، ئایەتی:٢٩.

بەکاربراون و لەسەردەستی ئەوانیش گەلێک لەم ڕەمزانە بۆ یەکەمجار بەکاربراون. پێش مەحوی، نالی لە بەیتێکدا کە سەرەتای غەزەلیاتی دیوانەکەیەتی، دەڵێت:

"جان بەر لەبی بۆسەی لەبتە عاشقی زارت

((فالبائس یستوهب من فیک معاشا))" (نالی، ٥٦)

"یا ڕەب ژ چ روو لەب ب سەنایا تە گوشایەم؟

((سبحانک لن احصی فی شانک حمدا))" (جزیری، ١٠)

لێو، لای سۆفییەکان گوتەیە، یاخود ئاماژەیە بە نەفسی ڕەحمانی[1] ئەم لێوە شیرینە، سەرچاوەی شیفایە بۆ عاشقانی دەردەدار، نالی دەڵێت: ((ئەی مەسیحای عەسر لەو لێوانە دەرمانم دەوێت!!))، یان لەوەدا کە دەڵێت: ((لێوی تۆ ئاوی بەقا، من خزرم!!)) لێرەدا باسی ئاوی حەیات دێتە گۆڕێ کە مانای ژیانی هەتا هەتاییە، دووبارە پەلکێشمان دەکەنەوە بۆ سەرچاوە عیرفانییەکە.

"خەتی سەبزی لە کەناری لەبی، 'نالی' هەروەک؛

'خزری زیندە' لەسەر چاهە زولالێکی هەیە" (نالی، ٤٧٤)

"لە وەقتێکا کە ڕۆحم گەییە سەر لەب، ڕۆحی من بە فیدات

---

[1]. . ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، ٢٩٥.

دەبێتە ڕۆحی تازە، ئەو لەبەم گەر بێنییە سەر لەب"        (مەحوی، ٨٤)

**سەرچاوکان:**

قورئانی پیرۆز

دیوانی شاعیران:

١. دیوانی مەلای جزیری، شەرحی: هەژار موکریانی، چاپ: اول، نشر پانیذ، سنه، سال: ١٣٩٣ه.

٢. دیوانی کۆما بەرهەمێ ئەحمەدێ خانی، تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، چاپ:؟،چاپ و وەشانێن: کۆمەڵگەها فەرهەنگی یا ئەحمەدێ، سۆران. ٢٠١٨.

٣. دیوانی نالی، لێکدانەوی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەیس و فاتیح عەبدولکەریم، چاپی دووەم، نشر پانیز، سنه، ١٣٩٦ه.

٤. دیوانی مەحوی، لێکدانەوەی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەیس و فاتیح عەبدولکەریم، پێداچوونەوە: صباح بەرزنجی، چاپی یەکەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠١٨.

٥. دیوانی سالم، لێکدانەوەی: ئیسماعیل کەسنەزانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاڵای ڕووناکی، سنه، ١٣٩٦ه.

٦. دیوانی کوردی، ساغکردنەوەی: محەمەد مستەفا، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، مەریوان، ه١٣٩٨.

٧. دیوانی وەفایی، لێکدانەوەی: محەمەد سەعید نەجارِی، چپی دووەم، انتشارات کردستان، سنە، ١٣٩٣هـ.

٨. دیوانی ئەدەب، کۆکاردنەوەی: محەمەد حەمە باقی چاپ؟، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠١٠'

٩. دیوانی ناری، لێکدانەوەی: عوسمان عارف ناریزادە، چاپی سێیەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٩.

١٠. دیوانی بێخود کۆکردنەوەی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم، انتشارات کردستان، سنە، ١٣٩١هـ.

١١. دیوانی ئەحمەد موختار جاف، لێکدانەوەی: عیزەدین موستەفا ڕەسوڵ، چاپی سێیەم، چاپخانەی هەژار موکریانی، هەڵەبجەی شەهید، ٢٠١٨.

١٢. دیوانی حەریق، ئامادەکردن: سەید نەجمەدین ئەنیسی، چاپ:؟، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠١٢.

١٣. دیوانی سافی هیرانی، پێداچوونەوەی: ئارمان کەریمی، چاپی یەکەم، چاپخانە: ؟، سەقز، ٢٧١٦ی کوردی.

١٤. دیوانی حەمدی، ساغکردنەوەی: عەبدوڵلا خدر مەولود. چاپ:؟، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٥. دیوانی کەمالی، ئامادەکردنی: کەمال عەلی باپیر، چاپ: یەکەم، چاپخانە:؟، بغداد، ١٩٨٦.

١٦. دیوانی ناتیق، لێکدانەوەی: حەکیم مەلا ساڵح، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٩.

١٧. دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکدانەوەی: سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، چاپی یەکەم، انتشارات کردستان، سنه، ١٣٩٠ه.

١٨. دیوانی زێوەر، کۆکردنەوەی: مەحموود زێوەر، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٩. دیوانی ئەمین ئوشنوویی، چاپی یەکەم، چاپخانە:؟، شوێن:؟، ١٣٧٧ ه.

٢٠. دیوانی عەبدوڵڵا پەشێو، بەرگی یەکەم(پشت لە نەوا، ڕوو لە کڕێوە)، چاپخانەی ڕۆشهەڵات، هەولێر، چاپی چوارەم، ٢٠١٦.

٢١. دیوان مولوی

٢٢. دیوان ناسر خوسرو

٢٣. دیوان حافز

٢٤. دیوان سعدی

فەرهەنگە کوردییەکان:

٢٥. فەرهەنگی خاڵ

٢٦. فەرهەنگی کاوە

٢٧. فەرهەنگی ئاناهیتا

فەرهەنگە فارسییەکان:

٢٨. فرهنگ لغت‌نامه دهخدا

٢٩. فرهنگ فارسی معین

٣٠. فرهنگ فارسی عمید

٣١. فرهنگ نام ها

٣٢. فرهنگ نظام

کتێبەکانیتر:

٣٣. کەمال جەلال غەریب، کەڵەفەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس ، شەقامی گوڵان-هەولێر، ٢٠١٢.

٣٤. مارف خەزنەدار، فەرهەنگی دیوانی نالی، چاپی دووەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر. ٢٠٠٨.

٣٥. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی، چاپ:؟، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١.

٣٦. مەسعود محەمەد، چەپکێک لە گوڵزاری نالی، چاپی دووەم ، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

٣٧. ئەحمەدی مەلا، مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و سەرچاوەکانی عیشق و وێنەی مەعشوقدا، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ساڵی چاپ ٢٠١٣.

٣٨. بوشڕا کەسنەزانی، شیعری کلاسیکی کوردی و تابووشکێنی، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٩.

٣٩. سەروەر حەسەن، قورئان و ڕوەکناسی، چاپی یەکەم، چاپخانەی تەفسیر، هەولێر.

٤٠. محمد دریایی، پزیشکی موعجیزەئاسای ڕووەکی، وەرگێڕانی: گەشتیار مستەفا ئەمین، چاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١٦.

٤١. خوسرەو جاف، حەرەمسەرا و خەساوەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١.

کتێبە فارسییەکان:

٤٢. دکتر حمیرا زمردی، نمادها و رمزهای گیاهی در شعر فارسی، چاپ اول، چاپخانه دایره سفید، تهران، ١٣٨٧ ه.

٤٣. دکتر غلامحسین رنگچی، گل و گیاه در ادبیات منظوم فارسی، چاپ اول، چاپ و صحفات بهمن، تهران ، ١٣٧٢ه.

٤٤. دکتر محمد جعفر یاحقی، فرهنگ اساطیر و داستان وارەها در حدبیات فارسی، چاپ چهارم، جاپخانه فرهنگ معاصر، تهران، ١٣٩١ه.

٤٥. ژان شوالیه - الن گربران، فرهنگ نمادها، ترجمه: سودابه فضایلی، چاپ: دوم، انتشارات جیمون، تهران، ١٣٨٤ه، جلد دوم.

٤٦. دکتر منوچهر دانش پژوه، فرهنگ اسطلاحات عرفانی، چاپ دوم، نشر فرزان، تهران، ١٣٨٦.

پەڕاوی ئینتەرنێتی

مقاله: دکتر حیدر قلیزاده، زلف و تعابیر عارفانه و عاشقانه آن در شعر فارسي.

حەمید درووودی، گوڵنامەی کوردی. (پەڕاوی ئینتەرنێتی)

ویکیپیدیا، دانشنامه آزاد.

**خدایان باستان:**

